# پیرەمێرد و زەریا

نووسەر: ئێرنێست هەمینگوای

وەرگێڕ: زانا شەریفیان

پیرەمێردێک بوو کە بە تەنیا لە بەلەمێک لە " گۆڵف ستریم" ماسی دەگرت و ئێستاس هەشتاو چوار ڕۆژ بەسەر چبوو کە هیچ ماسییەکی نەگرتبوو. لە چل ڕۆژی هەوەڵ کوڕێکی منداڵ کارەی لەگەڵ بوو. بەڵام چون چل ڕۆژ تێپەڕ بوو و ماسییان نەگرت، باوک و دایکی کوڕەکە وتیان ئیدی ڕوونەو سەلمێندراوە کە پیرەمێرد " سالائۆ" یە. کە خراپترین شێوەی ڕەش بەختییە و کوڕ بە ئەمری ئەوان ڕۆیشتە بەلەمێکی دیکەوە کە هەر حەوتەی هەوەڵ سێ ماسی چاکی ڕاو کرد. کوڕەکە خەفەتی دەخوارد بەو هۆیەی دەیدی پیرەمێرد هەموو ڕۆژ بە بەلەمی بەتاڵ دەگەڕێتەوە. هەمووکات دەڕۆیشت قوفڵەی گوریس یان گۆچانە سەر نووشتاوەکە و نێزە و چارۆگە[1] ئاڵاو بە کۆڵەکەی بەلەمەکەیەوە بۆ پێرەمێردەکە بە کۆڵ دەیکێشا. چارۆگەکە بە

لەت و پەتی تەلیسی ئارد پینە کرابوو، ئالاو، دەڵێی کە ئالای دۆڕانێکی هەتایی بوو.

پیرەمێردێکی کز و لاواز بوو و پشتە ملی بڕگەگەلێکی قووڵی تێدا بوو. پەڵەگەلێکی قاوەیی شێرپەنجەی خۆش کەری پێست کە لە تیشکدانەوەی تیرۆژ لە زەریای گەرمین بەدی دێت لەسەر گۆناکانی بوو. پەڵەکان هەر دوو لایەنی سیمای تا خوارەوە داپۆشابوو. لە کێشانی گوریسی ماسییە قورسەکان لەسەر بەری دەستی قەڵەشگەلێکی قووڵ وەدەر کوتبوون. بەڵام هیچ کام لەم هێڵانە نوێ نەبوون. بە چەشنی بڕگە گەلی بیابانە بێ ماسییە کۆنەکان بوو.

هەموو شتێکی پیرەمێرد کۆن بوو. جگە لە چاوەکانی، چاوەکانی بە چەشنی زەریا بوو و بەکەیف و پیرۆزمەند دیار بوو.

کاتێک بەو کەنارەی کە بەلەمەکەیان لەوێوە بۆ وشکی کێشابوو، هەڵدەگەڕان. کوڕەکە گوتی:" سانتییاگۆ، من دیسان دەتوانم لەگەڵ تۆ بێم، ئێستا بڕێکمان پارە هەیە."

پیرەمێرد ماسیگرتنی فێری کوڕەکە کردبوو و کوڕەکە خۆشی دەویست.

پیرەمێرد گوتی:" نا، بەلەمەکەت لە سەر بەختە، هەر لەگەڵ ئەوان بە."

" مەگەر لە بیرت نایات هەشتاو و حەوت ڕۆژ هیچ ماسییەکمان نەگرت، دواتر سێ حەوتە هەموو ڕۆژێک ماسی گەلێکی گەورە گەورەمان گرت."

پیرەمێرد گوتی: "لە بیرم دێ. دەزانم ڕۆیشتنت لەسەر بێ بڕوایی نەبوو."

" باوکم زۆری لێ کردم. منیش منداڵم دەبێ بە گوێی قسەی باوکم بکەم."

پیرەمێرد گوتی:" دەزانم، زۆریش ئاساییە."

" باوکم بڕوای زۆر نییە."

پیرەمێرد گۆتی: " ئەرێ، بەڵام ئێمە کە هەمانە، جگە لەوەیە؟"

کوڕەکە گوتی:" نا، دەتهەویت لە کافە ئاویجۆیەکت بۆ دەست خەم، دواتر ئەمانە ببمەوە بۆ ماڵێ؟"

پیرەمێرد گوتی:" باشە، ماسی گرەکان لەڕووی یەک دانامێنن."

بە یەکەوە لە کافە " تراس" دانیشتن، زۆرێک لە ماسی گرەکان گەمەیان لەگەڵ پیرەمێرد کرد و پیرەمێرد زیز نەبوو. چەنێک لە ماسیگرە بەساڵاچووەکان سەیریان دەکرد و دڵیان بۆی دەسووتا و بەزەییان پێیدا دەهات بەڵام نەیاندەدرکاند. بە ڕێزەوە سەبارەت بە خرۆشی ئاو و قوڵاییەک کە قولاپیان تێ هاویشتبوو قسەیان دەکرد، سەبارەت بە کەشی خۆش و ئەوانەی کە دیتبوویان. ماسیگرە سەرکەوتووەکانی ئەو ڕۆژە سەرجەم لە زەریا هاتبوونەوە و زگی مارلینەکانیان هەڵدڕیبوو ئەوانیان بە تەواوەتی لەسەر دوو لەتە تەختە بڵاو کردبووە و دوو پیاو، دوو سەری لەتەکانیان بە کۆڵ گرتبو و ماسییەکەیان بردبوو بۆ کۆگە. بۆ ئەوەی ماشێنە سەهۆڵ هەڵگرەکان بێن و ئەوانە بۆ بازاڕی هاوانا

بگەیەنن. ئەوانەی کە سەماسی گرتبوو، سەماسییەکانیان بۆ کارگەی ئەو دەسخۆرە بردبوو یان بۆ ئەوەی لەسەر بەرد و بە قولاپەکانیانەوە کەن. جەرگییان دەربێنن و باڵەکانیان ببڕن و پیستییان لێ کەنەوە و گۆشتەکەیان بۆ خوێ کردن درێژ درێژ ببڕن.

کاتێک با لە رۆژاواوە هەڵی دەکرد بۆنی کارگەی سەماسیەکان[٣] دەگەیشتە ئەسکەلەکە. بەڵام ئەمڕۆ تەنیا هەستێکی کەم لە بۆنەکە لە هەواکەدا دەکرا چونکە با بەرەو باکوور گەڕابووە و دوای ئەو نیشتبووە. لە تراس کەش و هەوا خۆرەتاو بوو.

کوڕ گوتی:" سانتییاگۆ"

پیرەمێرد گوتی:" بەڵێ"، پەرداخەکەی بە دەستەوە بوو لە بیری ساڵانی ڕابردوودای بوو.

" دەتهەوێت بڕۆم و بۆ سبێنێت ساردین بێنم؟"

" نا. بڕۆ یاری بەیس باڵەکەت بکە. من ئێستاش دەتوانم سەوڵ[٢] لێدەم. ڕۆلیگۆش تۆڕەکە دەهاوێژێت."

" دڵم پیوەیەتی بیگرم. ئێستا کە ناتوانم لەگەڵت بێم دەمهەوێت کارێکت بۆ بکەم."

پیرەمێرد گوتی:" ئاوجۆوەکەت کە بۆم کڕی، تازە بووی بە پیاو"

" هەوەڵ جار کە منت بە بەلەمەکە برد، چەن ساڵم بوو؟"

" پێنج ساڵ، هێندەی نەمابوو کە تێدا بچیت، ماسییەکەم کێشا سەرەوە ئێستاش گیانی تێدا بوو. خەریک بوو بەلەمەکەی تفر و توونا دەکرد، لە بیرت دێ؟"

" کلکیم لە بیر دێت کە دەیکوتی بەم لاو لادا، جێی سەوڵلێدانەکە شکا، دەنگی زرماو کوتی کلکیم لەبیر دێت. لە بیرم دێت منت خستە ژێر کەوانەکە کە گوریسە تەڕەکان لە وێ کەوتبوون بەسەر یەکدا. تەواوی بەلەمەکە لە ژێر پام دەلەرزاوە. بە دەنگی تۆ کە دەتکێشا بە سەری دا بە چەشنی دەنگی کەوتنی دار بوو، هەستم بە بۆنی خوێن دەکرد کە بە لەشم دا پرژا بوو. "

" بەڕاستی لە بیرت دێ یان من خۆم بۆتم وتووە؟"

"من لە هەوەڵ کەڕەتەوە کە بە یەکەوە ڕۆیشتین هەموو شتێکم لە بیر دێت."

"پیرەمێرد بە چاوگەلی هەتاگازی پڕلە ئەرخەیان و سۆز سەیری کرد."

گوتی: "گەر منداڵی من دەبووی بێ گوێدان بە مەترسی تۆم لەگەڵ خۆم دەبرد و خۆمان دەدا دەست چارەنووس. بەڵام تۆ منداڵی دایک و باوکتی، بەلەمەکەشت بە بەختە."

" بڕۆم ساردین بێنم؟ چوار چەشتەم پێ شک دێت."

"ئێستاش ساردینەکانی ئەمڕۆم هەیە. خوێ کراو لە نێو سنووقەکەدایە."

" بڕۆم چواردانەی تازەت بۆ بێنم"

پیرەمێرد گوتی: "یەکدانە." هیواو بڕوا بەخۆی لە ناو نەچبوو، بەڵام ئێستا هیواو و متمانەیەکەی گیانێکی دووبارەیی گرتبوو. بە وێنەی کاتێک کە شەماڵ هەڵدەکات.

کوڕ گوتی:" دوو دانە"

پیرەمێرد گوتی: "دوو دانە، نەتدزیبێتن؟"

کوڕ گوتی: "دەمهەوێت، بەڵام ئەمانەم کڕیوە."

پیرەمێرد گوتی: "زۆر سپاس." پیاوێکی زۆر سادە بوو و لە خۆی نەدەپرسی چۆن ئەم هەموو لەخۆبردوویە گوێڕایەڵییە فێر بووە بەڵام دەیزانی ئەم لەخۆ بردووەیە شتێکی ناشرین نییە و لە گەورەیی شکۆی پیاو کەم ناکاتەوە.

گوتی:" بەم تەوژمی ئاوە بەیانی رۆژێکی تایبەت دەبێت."

کوڕ پرسی:" دەتهەوێت بچیتە کوێ؟"

" دوور دەڕۆم، لەگەڵ گەڕانەوەی با منیش دەگەڕێمەوە، دەمهەوێت پێش ڕووناکی دەرکەوم."

کوڕ گوتی:" منیش هەوڵ دەدەم خاوەن کارەکەم بێتە ئەو دوورانە . گەر شتێکی گەورەو بەکار هاتووت گرت بێینە یاریدەت."

" ئەو حەز ناکات زۆر دوور بڕوات."

کور گوتی:" نا، بەڵام من دەڵێم شتێکم دیوە کە چاوەکانی نەبینێت، بۆ چەشن دەڵێم باڵندەیەک بەسەر ڕاوەکە دەسووڕێتەوە. ناچاری دەکەم بۆ گردتنی دۆلفینێک بێت."

" یانی چاوەکانی هێندە کز و لاواز بوون؟"

" کوێرەمووشەیە."

پیرەمێرد گوتی:" شتێکی سەیرە. ئەو کە هیچکات بۆ ڕاوی کیسەڵ نەڕۆیشتووە. کیسەڵ چاوەکان لە ناو دەبات."

" بەڵام تۆ چەن ساڵێک دەڕۆیشتی بۆ ڕاوی کیسەڵ لە کەنارەکانی مۆسکیتۆ، چاوەکانت هیچ کێشەیەکیان نییە."

" من پیرەمێردێکی سەیر و سەمەرم."

" ئێستا گەر لەو ماسییە گەورە بەکارهاتووانە ڕاوکەی هێزت هەیە؟"

" لە خۆم ڕادەبینم هەرچەن کار فێڵی زۆری دەوێت."

کوڕ گوتی:" وەرە ئەمانە ببەینەوە بۆماڵەوە، با من تۆڕەکە بێنم، دواتر بڕۆم بۆ ساردینەکان."

کەل و پەلە پێویستەکانیان لە بەلەمەکە هەڵگرت. پیرەمێرد کۆڵەکەکەی بە شان هەڵگرت و کوڕەکەش سندووقە دارینەکەی کە کلافی گوریسە قاوەییەکە کە بە توندی لە یەک ئالا بوونی پێ بوو، هەروەها گۆچانە قولاپ دارەکەو نێزەکان و دەسکەکانی. سندووقی چێشتەکان لە ژێر تەختەی پشتەوەی بەلەمەکە بوو لە

تەنیشت تێڵایەک کە پیرەمێرد ماسییە گەورەکانی دوای کێشانە نێو بەلەمەکە سەریانی پێ دەکوتا. کەس هیچ شتێکی لەم پیاوە نەدەدزی. بەڵام باشتر بوو کە چارۆگەو و گوریسە ئەستوورەکان ببەنەوە بۆ ماڵەوە چونکە شەونەم دەیانڕزێنێت. هەرچەن پیرەمێرد دەیزانی کە لە خەڵکی ئەوێ کەس شتی لێ نادزێت، بەڵام بە خۆی دەگوت نابێت بە دانانی نێزەکان و گۆچانە قولاپییەکە لە بەلەمەکەدا لەخۆوە دڵێک بۆ دزین هان بدەم.

بە یەکەوە لە ڕێگاکە سەرکەوتن و گەیشتنە کوختی پیرەمێرد، لە درگا کراوەکەیەوە چوونە ژوورەوە. پیرەمێرد کۆڵەکەکەی بە چارۆگە پێچراوەکەیەوە بە دیوارەکەوە هەڵیپەسارد و کوڕەکەش سندووق و شتەکانی دیکەی لە کەنارێکەیەوە دانا. درێژی کۆڵەکەکە کەم تا زۆرێک بە ئاستی درێژی کوختەکە بوو. ماڵەکەیان بە گەڵا قایمەکانی نەخڵی شاهانە کە "گوانۆێ" پێ دەڵێن سازیان کردبوو و لە نێویدا شوێنێکی خەوتن مێزێک کورسییەک و لەسەر زەوییە خۆڵییەکەی قووڵکێک بۆ خواردن سازکردن بە زوخاڵ . لە سەر دیوارگەلی قاوەیی ڕەنگی گەڵا قایم و پتەو و بەسەر یەک کەوتووی گوانۆ، قاپێکی وینەی ڕەنگی حەزرەتی مەسیح و یەکێکی حەزرەتی مریم بوو. ئەمانە یادەوەری وئاسەواری بە جێ ماوی ژنە مردووەکەی بوو. سەردەمێک وێنەیەکی ڕەنگی لە ژنەکەشی بە دیوارەکەوە بوو بەڵام پیرەمێرد ئەوی هەڵ گرتبوو چونکە دڵی دەگیرا کاتێ سەیری دەکرد و ئێستاش ئەو وێنەیە لە تاقی لای ڕاستی ژوورەکە لە ژێر کراسە خاوێنەکەی دا بوو.

کوڕەکە پرسی :" شتێکت هەیە بیخۆی؟"

" مەنجەڵێک برینجم بە ماسییەوە هەیە، دەتهەوێ تۆش برێکی لێ بخۆی؟"

"نە، دەڕۆم لە ماڵەوە شێو دەخۆم. دەتهەوێت، ئاگرەکەت بۆ هەڵکەم؟"

"نا، دواتر خۆم هەڵی دەکەم، رەنگە برینجەکە بە ساردی بخۆم."

" ڕێگا دەدەی تۆڕەکە ببەم؟"

" بە دڵنیایی"

تۆڕێک لە گۆڕدا نەبوو کوڕەکە بیری کەوتەوە کە فرۆشتوویانە، بەڵام هەموو رۆژێک ئەم یارییەیان دەکرد. مەنجەڵی برینج و ماسییەکیش لە ئارادا نەبوو کوڕەکە ئەمەشی دەزانی.

پیرەمێرد گوتی:" هەشتاو پێنج ژمارەی بەختە، دەتهەوێت بەیانی ماسییەک لەگەڵ خۆم بێنمەوە کەشێکی زۆری بێت؟"

" من تۆڕەکە هەڵدەگرم و دەڕۆم بۆ ساردین. تۆ دەتهەوێت لە هەیوانەکەو لەبەر تاو دانیشی؟"

" ئەرێ ڕۆژنامەی دوێکەم هەیەو هەواڵی بەیس بۆڵەکەی دەخوێنمەوە."

کوڕەکە نەیدەزانی ڕۆژنامەی دوێنێ یارییە یان نا. بەڵامم پیرەمێرد لە شوێنی خەوەکی دەری هێناو لێدوانی لەسەر کرد:"

" پریکۆ دوێنێ لە کافە پێمی دا"

" ساردینەکانم کە دەسکەوت دەگەڕێمەوە. ئەوەی تۆ و خۆم بەیەکەوە لەسەر سەهۆڵ دادەنێم. بەیانی هەڵیاندەبژێرم کاتێک گەڕامەوە باسی بەیس بۆڵەکەم بۆ بکە."

" یانکییەکان دۆڕانیان نییە"

" بەڵام من لە سوور پێستەکانی کلیولەند دەترسم."

" ئیمانم بە یانکییەکان هەیە کوڕەی گیان، دیماجۆی گەورەت لە بیر بێت."

" ئاگادار بە ، دەنا لە سوورەکانی سین وییانتی یا ساکس سپی شیکاگۆش دەترسی."

" هەواڵەکان بخوێنەوە کە گەڕامەوە بۆم بڵێ."

چۆنە بلیتێکی بەخت کە ژمارەکەی هەشتاو پێنجە بکڕین؟ ئاخر سبەینێ ڕۆژی هەشتاو پێنجومە."

کوڕەکە گوتی:" بیرێکی خراپ نییە، بەڵام هەشتاو حەوتت پێ چۆنە؟ زۆرترن پێوانەی تۆ هەشتاو حەوتە."

" پێشهات یەک جارە بڵێی دانەیەک هەشتاو پێنج دەست خەی؟"

" دەتوانم داوایەک بکەم"

" بلیتێک دەبێتە دوو دولار و نیو. لە کێ دەتوانین قەرز بکەین؟"

" کارێکی نییە . من هەمووکات دەتوانم دوو دلار و نیو قەرز کەم."

" بیر دەکەمەوە منیش بتوانم. بەڵام تا دەتوانم قەرز ناکەم، هەوەڵ قەرز کردنە دوایی سواڵکەری."

کوڕ گوتی:" جل و بەرگی گەرم بپۆشە باوکە. کۆتاییەکانی پاییزە."

پیرەمێرد گوتی:" وەرزی ماسی گەورەیە. بەهار هەرکەسێک ببینی دەتوانێت ماسی گر بێت."

کوڕەکە گوتی:" من ڕۆیشتم بەدوای ساردینەکاندا."

کاتێک کە کوڕەکە گەڕایەوە، پیرەمێرد لەسەر کورسییەکەی خەوی لێ کەوتبوو تاو نیشتبووە. کورەکە پەتووە سەربازییە کۆنەکەی لەسەر جێ خەوەکەی هەڵ گرت و ئەوی بەسەر پشتەوەی کورسییەکەو شانەکانی پیرەمێرد کێشا. شانەگەلێکی غەریبی بوو. ئێستاس هێزیان بوو. هەرچەن کە زۆر پیر ببون. ملیشی پڕ زۆر بوو، کاتێک پیرەمێرد لە خەودا بوو سەری کەوتبوو بە خوارێدا و بڕگەکانی هێندە ئاشکرا نەبوون. کراسەکەی هێندە پینەیان خواردبوو بە چەشنی چارۆگەی بەلەمەکە بوون. و پینەکانی لە بەرتاودا کاڵ ببوونەوەو و بە ڕەنگی جۆراو جۆر دەرهاتبوون. بەڵام سەری پیرەمێرد زۆر پیر بوو و بەچاوە بەستراوەکانی ئاسەوارێک لە ژیان لە سیمایدا نەبوو. ڕۆژنامەکە لەسەر ئەژنۆکانی بوون. و قورسایی دەستی ئەوی لە کزەی شەو دوور کردبوو، بێ خوست هێشتبوویەوە. پێخواس بوو.

کوڕەکە هەر وا لێگەڕاو لێیدا ڕۆیشت، کاتێ گرایەوە پیرەمێرد بەردەوام لە خەودا بوو.

کوڕەکە گوتی:"هەستە باوکە"، و دەستی خستە سەر یەکێک لە ئەژنۆکانی پیرەمێرد.

پیرەمێرد چاوەکانی کردەوە و ساتێک وای دەنواند کە لە سەر خۆ چووەو هاتووەتەوە بەخۆیدا. دواتر بزەیەکی پیشان دا.

پرسی:" ئەمە چییە بەدەستەوە؟"

کوڕەکە گوتی:" شێو، بەیەکەوە شێو دەخۆین."

" من برسیم نییە."

" بێ بخۆ، ناکرێ هەم بچی بۆ ڕاو و هەم هیچ نەخۆی."

پرەپیاو گوتی:" شتم خواردووە." هەستاو ڕۆژنامەکەی هەڵگرت و نووشتاندییەوەو دواتر دەستی کرد بە قەد کردنی پەتووەکە.

کوڕەکە گوتی:" پەتووەکە بخە سەر شانەت، تا من زیندووم بێ شێو ناچی بۆ ماسی گری."

پیرەمێرد گوتی:" گەر وایە تەمەن درێژ بی، بە خۆت بگە، چیمان هەیە بیخۆین؟"

" ماش و برینج لەگەڵ مۆزی سوور کراو، بڕێکیش خۆرشت."

کوڕەکە ئەمانەی لە مەنجەڵە دوو بەشی لە کافە تراس هێنابوو. دوو دەست چەقۆ و چەنگاڵ و کەوچک، هەرکام ئاڵاو لە دەستماڵێکی کاغەزی، لە گیرفانیدا بوو.

" کێ ئەمانەی پێداوی؟"

" مارتین، خاوەن کافە."

" دەبێ دەست خۆشی لێکەم."

کوڕەکە گوتی:" من دەست خۆشیم لێ کرد، تۆ پێویست ناکات."

پیرەمێرد گوتی:" گۆشتی زگی ماسییەکی گەورەی پێ دەدەم، ئێستا چەن جارە خواردنمان پێ دەدات وایە؟"

" وایە"

"گەر وایە دەبێت شتێک زۆرتر لە گۆشتی زگی ماسی پێ بدەم، زۆر ئاگای لێمانە."

" دوو ئاوجۆی بۆ ناردووین"

" بە ڕای من ئاوجۆی قوتی باشترین ئاوجۆیە."

" ئەرێ دەزانم، بەڵام ئەمانە شیشەن. ئابجۆی هاتۆیی، شیشەکانی دەگەڕێنمەوە."

پیرەمێرد گوتی:" زۆرت ئەرک کێشاوە. بخۆین؟"

کوڕەکە بە ئارامی گوتی:" من کە گوتم بخۆین، گوتم درگای مەنجەڵەکە لا نەدەم تا ئامادە دەبی."

پیرەمێرد گوتی:" من ئامادەم، تەنیا ویستم دەست و دەموچاوم بشۆم."

کوڕەکە بە خۆی گوت:" لە کوێ شۆردت؟" شێری ئاوی ئاوایی دوو کۆڵان خوارترە. کوڕەکە بە خۆی وت دەبێ ئاوی بۆ بێنم لەگەڵ سابوون و خاولییەکی خاوێن، بۆ هێندە من گێژم؟ دەبێت کراسێک و کۆتێکیش بۆ زستانی دەست خەم. جووتێ پێڵاوی بۆ جێبەجێ کەم، لەگەڵ پەتوویەکی دیکە.

پیرەمێرد گوتی :" خۆرشتەکەتان زۆر تایبەتە."

کوڕەکە گوتی:" چیرۆکی بەیسبۆڵەکەت بۆ نەگێڕامەوە."

پیرەمێرد بە خوشحاڵییەوە گوتی:" لە بەشی ئامریکایەکاندا یانکی بردییەوە هەر ئەوەی کە من گوتم."

کوڕەکە  گوت:" ئەمڕۆ دۆڕاندیان."

" هیچ کێشە نییە، دی ماجۆی گەورە لەسەر جێی خۆیەتی."

" لە یانەکەی کەسانی دیکەش هەن."

" بەدڵنیاییەوە، بەڵام کارەکە ئەو دەست پێدەکات. لە ڕیزەکانی دیکە،نێوان برووکلین و فیلادلفی، من هاندەری برووکلینم، بەڵام دیک سیسلەر بە لێدانە گەورانەی لە یاریگا کۆنەکە"

کەس ناگاتەوە بەو لێدانانەی.  من نەمدیوە کەس لێدانەکانی بەرزتر لەو بێت.

" لەبیرت دێ دەهات بۆ کافە؟من دەمویست لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ ڕاوە ماسی. بەڵام شەرمم دەکرد پێی بڵێم. دواتر بە تۆم وت پێی بڵێی، تۆش ڕووت نەبوو. "

" لەبیرمە زۆرمان هەڵە کرد. ڕەنگە کە بهاتایە. گەر لەگەڵمان بهاتایە تەواوی تەمەن بیرەوەریمان لێی دەبوو."

پیرەمێرد گوتی:" بە ئاواتەوە بووم دی ماجۆی گەورەم دەبرد بۆ ڕاوە ماسی.دەڵێن باوکی ماسی گر بووە. ڕەنگە کاتێک وەکوو ئێمە نەدار بووە. لە قسەی ئێمە تێدەگەیشت."

" باوکی سیسلەری گەورە هیچکات نەدار نەبووە. باوکەی کاتێ هاوتەمەنی من بوو لە یانە گەورەکان یاری کردووە."

" من کاتێ هاوتەمەنی تۆ بووم لە بەلەمێکی چارۆگەیی کارم دەکرد. بەرەو ئافریقا دەڕۆیشت. ئێوارە لە کەنارەکان چەن شێرم بینی."

" ئەرێ بیرمە کە وت بووت."

" سەبارەت بە ئافریقا قسە کەین یان بەیس باڵ؟"

کوڕەکە گوتی :" بەڕای من بەیس باڵ باشترە.لە جان جەی مەک گڕای گەورە بۆم بڵێ. کوڕەکە بەجێگای جەی بە ئیسپانیایی دەیوت خۆتا."

" پێشتر جارو بار ئەویش دەهات بۆ کافە بەڵام کەسێک ڕوو تاڵ و دەم پیس بوو.کاتێ عارەقی دەخواردەوە تێک دەچوو.ئاگای هەم لە پێشبڕکەی ئەسپ بوو هەم بەیس باڵ. هەمووکات ڕیزی ناوی ئەسپەکان لە گیرفانیا بوو. بەردەوامیش بە تەلەفوونەکەی ناوی ئەسپەکانی دەهێنا."

کوڕەکە گوتی:" لەو کاپیتانە گەورانە بوو، باوکم دەڵێ وەک ئەو هیچکات نەبووە."

پیرەمێرد گوتی:"  لەبەر ئەوەی زۆر دەهات بۆ ئێرە. ئەگەر دۆ ڕۆشێریش بهاتایە باوکت دەیوت ئەو گەورەترین کاپیتانە."

" بەڕاستی گەورەترین کاپیتان کێیە؟ لۆک یان مایکڵ گۆنزالۆ؟"

" بەڕای من هەر دووکیان هاوتاییەکن."

" تۆش باشترین ماسی گری."

" نا باشتر لە منیش هەیە."

کوڕەکە گوتی :" ماسی گری باش زۆرە بڕێکیشان گەورەن، بەڵام تۆ تەنیا خۆتی."

" زۆر سپاس دڵمت خۆش کرد.هیوادارم کاتێک ماسییەکمان تووش نەبێت کە هێندە گەورە بێت نەتوانین دەرەقەتیبێین و قسەکەمان سەر ئاو کەوێت."

" گەر ئەو شێوەی دەڵێی هێزت هەیە چۆن ماسییەک پەیدا نابێت."

پیرەمێرد گوتی:" ڕەنگە ئەویش هێندە کە خەیاڵ دەکەم هێزی نەبێت. بەڵام لێهاتووییم هەیە، گێچەڵیش لەکارما هەیە."

" ئێستا دەبێت بخەوی بۆ ئەوەی ماندووییەکەت بە تەواوەتی دەرچێ."

" من ئەمانە دەبەمەوە بۆ تڕاس و دەیدەمەوە."

" گەروایە شەوخۆش ، بەیانی هەڵت دەستێنم."

کوڕ گوتی:" تۆ کاتژمێری چاڵمەی منی."

پیرەمێرد گوتی:" کاتژمێری چاڵمەی من پیرییە، پیرەمێردەکان بۆچی هێندە زوو هەڵدەستن؟ بۆ ئەوەی ڕۆژەکەیان درێژتر بێت؟"

کوڕ گوتی:" چۆن بزانم.من دەزانم کە منداڵان درەنگ هەڵدەستن و خەویان قورسە."

پیرەمێرد گوتی:" ئەریّ لەبیرمە لەسەر کات هەڵت دەستێنم."

" دڵم نایات ئەو هەڵم ستێنیّ. گەر ئەو هەڵم ستێنیّ وەک ئەوەیە ئەمرم بەسەر دەکات."

" دەزانم."

" ئاسوودە بخەوە باوکە."

کوڕەکە ڕۆیشتبووە دەرەوە. بیّ چرا شێویان خواردبوو. پیرەمێرد پانتۆڵەکەی دەرهێناو لە تاریکیدا چووە پێخەفەکەیەوە. پانتۆڵەکەی گڕمۆڵە کرد و کردیە باڵنج، ڕۆژنامەکەشی خستە نێوانی. خۆی لە پەتووەکەی ئاڵاند و لەسەر ڕۆژنامەکانی دیکە کە لەسەر فەنەری تەختەکە بوو ڕاکشا.

هێندەی نەبرد کە چووە خەو، خەونی ئافریقای دەدی. کاتێک کە منداڵ بوو کەنارە درێژ و زێڕین و کەنارە سپییەکان، هێندە سپی

کە دەیدا لە چاو. دۆڵە گەورەکان کێوە قاوەییەکان هەموو ئەو دیمەنانە دەهاتنە خەونیەوە. ئێستا هەموو شەوێک لە کنارەکان دەژیا. لە خەونەکانی دا خرۆشی شەپۆلەکانی دەبیست. و بەلەمە خۆییەکانی دەدی کە لە نێو شەپۆلەکان دێنە پێش. بۆنی قیر و دار بەڕۆی تەختی کەشتییەکەی لووتی دەگرتەوە. و بۆنی ئافریقا کە لەگەڵ شەماڵی دەمەوبەیانی لە وشکییەوە دێت. هەمووکات کە هەستی بە بۆنی نەسیمی بەیانی دەکرد هەڵدەستا. و جل و بەرگی لەبەر دەکرد و دەڕۆیشت کوڕەکەی هەڵدەستان، بەڵام ئەمشەو بۆنی نەسیمی کەنارەکان زۆر زوو هات و ئەویش لە خەوی دا دەیزانی ئێستا زووە. بەردەوام خەوی دەبینی. لووتکەی سپی دوورگەکانی دەبینی کە لە نێوان زەریا. هاتبوونە سەر. دوای ئەو خەونی بەندرگەو لەنگەرگەکانی دوورگەی قەناری دەدی.

ئیدی نەخەونی فەرتەنەکانی دەدی نە خەونی ژن و ڕووداوە گەورەکان. نە ماسی گەورەو و پاڵەوانەتی و نەخەوی هاوژینەکەی.ئێستا تەنیا خەونی شوێنەکانی دەدی. و خەوی شێرەکان لە کەنارەکاندا. شێرەکان لەبەر تریفەی شەوانە،وەک پشیلە یارییان دەکرد. ئەو خۆشیانی دەویست. بەو شێوەی کە کوڕەکەی خۆش دەویست. کوڕەکەی هیچکات لە خەودا نەدەدی. جارێک کە لە خەوهەستاو لە درکا کراوەکەوە چاوی لە مانگ کرد و پانتۆڵەکەی کردەوەو لەبەری کرد. لەدەرەوەی کۆختەکە میزی کرد و ڕێگاکەی گرتە بەر بۆ ئەوەی کوڕەکە هەستێنێت. لەشی لەسەرمای سەرلەبەیانی هەڵدەلەرزا. بەڵام دەیزانی هێندە دەلەرزێت کە گەرم بێت و سەوڵە لێدات.

درگای ماڵی کوڕەکە دانەخرابوو. درگاکەی کردەوەو بە پێ خواسی هێواش چووە ژوورەوە. کوڕەکە لە ژوورە هەوەڵەکەی لەسەر تەختەکەی خەوتبوو. و پیرەمێرد لەبەر مانگەشەوێکی نیوەگیاندا کە لە پەنجەرەکەوە خۆی دەکێشا ژوورەوە. هێواش لاقێکی گرت و هێندە ڕایگرت تا کوڕەکە هەستا و تلی خوارد و چاوی لێکرد. پیرەمێرد سەری تەکان دا و کوڕەکەش پانتۆڵەکەی لەسەر کورسی تەنیشت شوێنی خەوەکەی هەڵگرت.

لەسەر شوێنی خەوەکەی دانیشت و لەبەری کرد.

پیرەمێرد لە درگا چووە دەرەوە. کوڕەکەش بەدوایە چووە دەرێ. کوڕەکە خەواڵوو بوو، و پیرەمێرد دەستی لەسەر شانەکانی دانا و گوتی، ببوورە.

کوڕەکە گوتی:" کێشە نییە، کاری پیاو هەر ئەمەیە."

لە کۆڵانەوە سەرەو خوار بوون و چوونە ماڵی پیرەمێرد و لە تەواوی ڕێگا، لەتاریکی، پیاوان بە پێخواسی ڕێگا دەڕۆیشتن و کۆڵەکەی بەلەمەکانیان دەبرد.

کاتێ گەیشتنە ماڵی پیاوەکە، کوڕەکە جێی گوریسەکان و گۆچانە سەر نووشتاوەکەو نێزەکانی هەڵگرت. و پیرەمێرد کۆڵەکەو و چارۆگەی ئاڵاو پێیەوە بە کۆڵ هەڵگرت.

کوڕەکە پرسی:" قاوە دەخۆی؟"

هەوەڵ کەرەسەکان و شت و مەکەکان بخەینە نێو بەلەمەکە دواتر دەخۆینەوە.

شوێنێک کە دەمەو بەیانی بۆ ماسیگرەکان دەیکردەوە، لە نێو قوتووی شیر هەنگوین قاوەیان خواردەوە.

کوڕەکە پرسی :" چۆن خەوتی باوکە؟ ئیدی خەریک بوو هەڵدەستا هەرچەن بۆی دژوار بوو کە لەخەوەکەی جوودا بێتەوە.

پیرەمێرد گوتی:" زۆرباش مانۆلین، ئەمڕۆ ئەرخەیانم."

کوڕەکە گوتی:" دڵی منیش، ئێستا دەبێ بڕۆم ساردینەکانی تۆ و خۆم و چێشتە نوێکانی تۆ بێنم." ئەو هەمووکات خۆی کەرەسەکان دێنێت، هیچکات ناهێڵێ کەس بیهێنێت.

پیرەمێرد گوتی:" نێوانی ئێمە جیایە، کاتێ تۆ پێنج ساڵان بووی دەمهێشت بیانهێنی."

کوڕەکە گوتی:" بۆ خۆم دەزانم، ئێستا دێمەوە. تۆ لێرە قاوەیەک بخۆ، ئێرە شوێنێ بینینەوەمانە."

بە پێخواسی بەسەر بەردە مەرجانییەکان بەرەو سەهۆڵدانەکە کە چێشتەکانی لەوێ دانا بوو ڕۆیشت. پیرەمێرد بە هێواشی قاوەکەی خواردەوە. ئەمە خواردنی تەواوی ڕۆژی بوو و دەیزانی دەبێ تەواوی بخواتەوە. ماوەیەکی درێژ بوو کە تاقەتی نان خواردنی نەبوو. توێشەیەکی لەگەڵ خۆی نەدەبرد.گۆزەیەکی ئاو لەژێر پێی بەلەمەکەی بوو کە بۆ تەواوی ڕۆژی تەواو بوو.

لەم کاتەدا کوڕەکە گەڕابووە. بە ساردین و دوو چێشتە کە لە نێو ڕۆژنامە ئاڵاندبوو. ڕێگایان گرتە بەر و ڕۆیشتن.

پیرەمێرد گوتی:" بەسڵامەت." تەنافی ڕاگری سەوڵەکانی بە بزمارە دارییەکانەوە گرێ دا و بەسەر سەوڵەکان نووشتایەوەو بڕیاری بە سەوڵە لێدان و چوون بۆ پێشەوە و لە تاریکی لە بەندەرگاکە دوور کەوتنەوە دا. بەلەمەکانی دیکەش لە کەنارەکەوە دەڕۆیشتە زەریاوە و دەنگی سەوڵە لێدانەکانیان و کەوتن و قرچەی سەوڵەکانیانی لە ئاو دەبیسترا. هەرچەن ئێستاکە مانگ کەوتبووە پشتەوەی بەرزاییەکان نەیاندەتوانی خۆیان ببینن.

جاروبار کەسێک لە بەلەمێکدا قسەی دەکرد. بەڵام لە زۆرینەی بەلەمەکان دەنگ و هەرایەک نەدەهات. تەنیا ڕۆ کردنی سەوڵەکان لە ئاودا نەبێت. دوای ئەوەیکە لە دەمەی بەندەرگاوە چوونە دەرەوە، بڵاوە بوون. هەرکامیان ڕۆیشتن بۆ شوێنێکی زەریا بەو هیوایە کە لەوێ ماسی لێبێت. پیرەمێرد زانی کە دوورکەوتۆتەوەو بۆنی وشکی بەجێ هێشت. بۆ نێو بۆنی بێگەردی کازیوەی زەریا سەوڵەی لێدەدا. ڕووناکی درەوشاوەی گیاکانی کەنداوی دەدی و بە سەوڵە لێدان لەوبەشەی زەریاوە تێپەڕ دەبوو کە ماسیگرەکان ناویان نابوو " چاڵەی گەورە"، چون لە ناکاو قووڵایی ئاوکە دەگەیشتە حەوتسەد باڵا و لە ئاکامی سووڕانەوەی تەوژمی ئەو لەسەر لێژایی گەورەی بنەوەی زەریا هەموو جۆرە ماسییەک لەوێ کۆ دەبوونەوە. ئێرە ناوەندی ئەنگوش[٤] و ماسی چێشتەکانە، جاری وایە لە قووڵایی ترین چاڵەکان پۆلی ماسییە پانەکان دەدۆزرێتەوە، کە شەوانە دێنە سەرەوە لە ئاوەکە و تەواوی ماسییە ڕێبوارەکان لێیان دەخۆن.

لە تاریکی دا پیرەمێرد هەستی بە هەڵاتنی ڕۆژ دەکرد و دەنگی لەرانەوەی ماسییە باڵدارەکانی کە لە ئاوەکە دەردەپەڕینە

دەرەوە دەنگی خیسکە خیسکی باڵەکانیانی دەبیست باڵە چڕەکانیانی دەبیست کە لە تاریکدا دوور دەبوو. زۆر خۆشی لە ماسییە هەڵفڕەکان دەهات چونکە لە زەریادا لە باشترین هاوڕێکانی بوون. بۆ باڵندەکان دڵی دەسووتا، بەتایبەت بۆ باڵندە چکۆلەو ناسکە ڕەنگ ماتەکان کە بەردەوام لە فڕین و گەڕاندا بوون و شتێکیان نەدەدۆزییەوە، پیرەمێرد بیری دەکردەوە ژیانی مریشکەکان لە ئێمە دژوارترە، جگە لە مریشکە چەتەکان و بەهێزەکان. مریشکی بەم ناسکییە و جوانییە بەچەشنی پەرەسێلکە زەریاییەکان بۆ درووست کردووە کاتێک زەریا هێندە بێ بەزەییە دەبێت؟ زەریا میهربان و زۆر جوانە، بەڵام زۆریش بێ بەزەییە، و ئەویش لە ناکاو ئەم مریشکانە کە دەفڕن و خۆیان لە ئاوەکە دەدەن و ڕاو دەکەن بەو دەنگە چکۆلەو بە پەژارەیان، جەستەی کز و لاوازیان لەبەرانبەر زەریا خۆڕاگر نییە.

هەمووکات لە ئەندێشەیا زەریای "لامار" ناودەنا و ئەمەش ناوێکە کە لە زمانی ئیسپانیایی کەسانێک کە زەریایان خۆش دەوێت بە زەریای دەبەخشن. جاری وایە خۆشەویستانی زەریا، بە زەریا قسەی ناشرین دەڵێن، بەڵام جوێنەکە وا دەدەن کە دەڵێی زەریا ژنە. چەنێک لە ماسیگرە لاوەکان ئەوانەی کە گوریسەکانیان خڕەی سەر ئاوی هەیە لە پارە زۆرەکەی ڕۆژە خۆشەکانی بازاڕی جەرگی سەماسی بەلەمی ماتۆڕییان کڕیوە زەریا " ئێل‌مار" ناو دەنێن کە نێرینییە. لە زەریا وەک بەرانبەرێک یان شوێنێک یان تەنانەت دوژمنێک ناو دەبەن بەڵام پیرەمێرد هەمووکات لە خەیاڵی دا زەریای بە چەشنی ژن دێنێتە ئەژمار یان وەک شتێک کە هەم دڵسۆزەو هەم دڵ پڕ. هەرکات کارێکی ناشرین یان دڕەندانەی لێ دەردەکەوێت بەو هۆیەیە کە دەسەڵاتی نییە. وا

بیری دەکردەوە مانگە شەو زەریا دەگرێتەوە، بەو شێوەی کە ژنان دەگرێت.

بەردەوام سەوڵی لێدەداو ئەم کارە هێزی زۆری نەدەویست. چونکە سەوڵەکەی لەگەڵ خێرایی بەلەمەکە دەکێشا، زەریا مەند بوو مەگەر جاری وا ڕەوەتی ئاو دەسووڕایەوە. لێی دەگەڕا دوو بەشی کارەکە زەریا بەڕێیەوە ببات. کە گزنگی خۆر ڕووی نواند، لەو ئاستەی کە بیری دەکردەوە زۆرتر ڕۆیشتبوو. لەگەڵ خۆیدا گوتی:" من لەم چاڵە قووڵانە حەوتەیەک گەڕام و هیچێکم دەست نەکەوت ئەمڕۆ دەڕۆم بۆ شوێنێک کە پۆلی ماسی بوونیتا و ئالباکرۆی لێ بێت، ڕەنگە بەختم لەگەڵ یەکێک لەو گەورانەی بێت."

بەر لەوەیکە وڵات تەواو ڕووناک بێت، پیرەمێرد چێشتەکانی خستبووە نێو ئاو و لەگەڵ تەوژمی ئاوەکە دەڕۆیشت. یەک لە چێشتەکان چل باڵا چبووە ئاوکەوە دووەمی حەفتاو پێنج سێیەمی و چوارەمی لە ئاوی شیندا سەود و سەدو بیستوو بێنج چبوونە ئاوەکەوە. چێشتەکانی سەرەو بن هەڵواسابوو، لاسقەی قولاپەکان لە نێو ماسییە چێشتەکە توونوند گیر درابوو و دووورابووە، و تەواوی بەشەکانی لەدەرەوەی قولاپ، نووشتاو و نووکی تیژی لە ژێر ساردینەکە داشاردرابوو. قولاپەکە لە هەردوو چاوی سارینەکانەوە تێپەڕ دەبوو بە شێوەیەک کە لە دەوری ئاسنی قولاپەکە خرێکیان ساز کردبوو. بەڵام هیچ شوێنێکی قولاپەکە نەبوو ماسییە گەورەکە دەمی لێنەدابێت،و تام و چێژێکی خۆشی نەبێت.

کوڕەکە دوو ئاڵباکۆی چکۆلەی پێدابوو کە بەچەشنی شاخوڵێک بە دوو گوریسەوە گرێی دابوو. بە گوریسەکانی دیکە ڕانێرێکی

گەورەی شین و ماسییەکی ئازادی زەردی لێدابوو، کە پێشتریش بەکار هێنرابوو. بەڵام ئێستاش خراپ نەببوو و ساردینە زۆر چاکەکان ئەوانیان بۆن خۆش و ددانگر دەکرد. هەرکام لە گوریسەکان بە ئەستووری پێنووسێکی گەورە بەدەوری لاسقێکی نەرم پێچرابوون هەر ئەوەیکە چێشتەکە دەکێشرا یان دەجووڵایەوە لاسقەکە سەرەکەی دەکەوتە نێو ئاوەکە. هەر گوریسێک دوو ئاڵقەی بوو هەرکامیان بالآیان چل بوو، کە دەکرا بە ئاڵقەکانی دیکەوە گرێ بدرێن بەشێوەیەک کە هەرکات پێویست ببوایە پیرەمێرد دەیتوانی پتر لە سێسەد باڵا گوریس بدات بە ماسییەکان.

پیرەمێرد سەر بردنە نێو ئاوی لاسقەکانی سەیر دەکردو هێواش سەوڵی لێدەدا، بۆ ئەوەی گوریسەکان ڕێک و سەرەونوخون ڕاوەستن، و لە قووڵایی گونجاوی خۆیاندا بن. ئاسمان ڕووناک ببووە، وتت کە کاتی ئەوە هاتووە تاو هەڵبێت.

هێڵێک لە تیشکی تاو لە ڕووی ئاو خۆی نواند و پیرەمێرد بەلەمەکانی دەدی کە ڕاکشاو بەسەر ئاودا، لە دوورەوە لە تەنیشت کەنارەکان، لەسەر تەوژمی ئاو بڵاوە ببوون. تاو ڕووناکتر بوو درەوشانەوەکەی کەوتە سەر ئاو ئەوکات بە لێبوونەوەی لە ئاو زەریای مەنگ تیشکی بۆ چاوی پیاوەکە دەدایەوە. بەشێوەیەک کە چاوی دەکوتا، پیرەمێرد بێ ئەوەیکە سەیری خۆر بکات سەوڵی لێ دەدا. سەیرێکی ئاوی ژێرلاقەکانی کرد و چاوێکی بە گوریسەکاندا گێڕا کە سەرەونوخوون کەوتبوونە بەشە تارمایی ئاوەکەوە. ئەو گوریسەکانی لە کەسانی دیکە قیت تر دەگرت، بەشێوەیەک کە لەهەر قووڵایی لە بەشە تارمایی ئاوەکە هەر

چێشتەیەک چاوەڕێی ماسییەک بوو کە لەوێوە تێپەڕ دەبوو. کەسانی دیکە گوریسەکانیان بە ڕەوەتی ئاوەکە دەسپارد و جاری وا کۆتایی گوریسەکان لە قوولاییی شەست بالا بوو ماسیگر وا هەستی دەکرد کە لە قوولاییی سەد بالادایە.

بەڵام پیرەمێرد بەخۆی دەگوت من گوریسەکەم ڕێک کردووە، ئەوەی هەیە بەختم لەگەڵدا نییە، بەڵام کێ چی دەزانێ؟ ڕەنگە ئەمڕۆ لەگەڵمدا ڕێ هات. هەر ڕۆژ، ڕۆژێکی نوێیە. باشتر وایە کە بەخت لەگەڵتا بێت، بەڵام تۆ کارەکەت جێبەجێ کە. ئەوکات کە بەخت ڕووی تێ کردی، تۆ ئامادەی.

دوو کاتژمێرێک دەبوو کە تاو هەستابوو، و نیگا لە ڕۆژهەڵات هێشتنەوە هێندەی چاوی پیرەمێرد ئازار نەدەدا. تەنیا سێ بەلەم لە دیمەنەکەی پێش چاوی دا بوون. و بەلەمەکان لە دوورەوە لەلای کەنارەکە، بێ هەرا لەسەر ئاوەکە نزم ڕاکشابوون.

پیرەمێرد بەخۆی گوت لە تەواوی تەمەنمدا تاوی بەیانی لەچاومی داوە، بەڵام چاوەکانم ئەمێستاش تیژبینن، خۆرنشین دەتوانم ڕاستەوخۆ سەیری خۆر بکەم و چاوم ڕێشکەوپرێشکە نەکات. ئێواران هێزی خۆر زۆرترە بەڵام بەیانیان لە چاو دەدات و کزەی لێ دێنێت.

هەر لەم کاتەدا بوو کە پیرەمێرد بازێکی زەریایی بینی کە بە باڵە درێژ و ڕەشەکانی لە ئاسمانی سەریەوە دەسووڕاوە، باڵندەکە توونت خۆی لە ئاوەکە دا و بە باڵە کێشرا بۆ دواوەی لار نیشتەوە دواتر دیسانەوە دەستی کرد بەسووڕان .

پیرەمێرد بەدەنگی بەرز گوتی:" ئەمە شتێکی دیوە لەخۆوە سەیر ناکات و ناسوورێتەوە."

هێواش و هاوئاهەنگ بەو شوێنەی کە باڵندەکە دەسووڕایەوە خۆی کێشا پەلەی نەدەکرد و گوریسەکانی قیت و سەرەو خوار ڕادەگرت. بەڵام برێک خێراتر لە تەوژمی ئاوەکە ڕۆیشت، لە ئاستێکی دیاریکراودا دەڕۆیشت برێک خێراتر گەر باڵندەکە ڕێنوێنی نەکردایی دەڕۆیشت.

باڵندەکە لە ئاسمان بەرزتر فڕی و دیسان سووڕێکی خوارد. بێ ئەوەی باڵەکانی ببزوێنێت، دواتر لە ناکاو خۆی تێهاویشت و پیرەمێرد چەن ماسییەکی باڵندەی دی کە لە ئاو دەرپەڕین و دابڕاو لە ئاوەکە دەفڕین.

پیرەمێرد بە دەنگێکی بەرز گوتی:" دۆلفین، دۆلفینی گەورە."

سەوڵەکانی لە نێو بەلەمەکە دانا و ئاڵقەیەکی گوریسی چکۆلەی لە بن تەختەکەی ژێری دەرهێنا. گوریسەکە سەر ئاڵقەی سیمی هەبوو و قولاپێکی مامناوەندیی پێوە بوو. پیرەمێرد یەکێک لە ساردینەکانی بەسەری قولاپەکەوە کرد. گوریسەکەی لە تەنیشت بەلەمەکەوە دا لە ئاوەکە دواتر کلکەکەی بە ئاڵقەی سەر تەختەکە گرێ دا، دوای ئەو چێشتەیەکی دیکەی بە گوریسێکەوە کرد و ئەوی لە سێبەری ژێر تەختەکە دانا. دیسانەوە دەستی کرد بە سەوڵە لێدان و هەروەها ئاگاداری بازە ڕەشە درێژباڵەکە بوو کە ئێستا لە نزیک ئاوەکە خەریکی جم و جۆڵ بوو.

لەگەڵ ئەوەیکە پیرەمێرد سەرنجی بازە زەرياييەكەی دەدا، بازەکە دووبارە خۆی کێشایە خوارەوە و باڵەکانی بۆ خۆ هاویشتن لە نێو ئاوەکە بۆدواوە خەواند. دواتر بە پەلەو لە بێ دەرئەنجام باڵی لێداو کەوتە دوای ماسییە باڵندەکان، پیرەمێرد بەرزایی ئاوەکەی دەدی کە دۆلفینە گەورەکان بەدوا کەوتنی ماسییە هەڵاتووەکان سازیان کردبوو. دۆلفینەکان لە ژێر فڕینی ماسییە باڵندەکان ئاوەکەیان هەڵدەدڕی و تا کاتێک ماسییەکان دیسان خۆیان لە ئاوەکە دەهاویشتەوە گورج پێیان بگەن، پیرەمێرد بە خۆی گوت، ئەم پۆلە دۆلفینە پۆلێکی گەورەن باشیش بڵاوە بوون و ماسییە باڵندەکان ڕێگایەکیان نییە. بەم مریشکەش هیچ ناگات. ماسییە باڵندەکان زۆر گەورەن و خێراش دەفڕن.

بازداییني بەردەوامی ماسییە باڵندەکان و هەوڵە بێسوودەکانی بازەکەی سەیر دەکرد، لەگەڵ خۆی گوتی پۆلی دۆلفینەکان لە دەستم هەڵاتن. خەریکن زۆر تووند و زۆر دوور دەڕۆن. بەڵام ڕەنگە یەکێک لە بەجێماوەکانی بکەوێتە چنگم، ڕەنگە ماسییە گەورەکەی منیش لەگەڵیان بوو، ماسییە گەورەکەی منیش دەبێت لە شوێنێکدا هەبێت.

هەورەکانی سەر وشکی ئێستا وەک کێو بەرزببوونەوە و کەنارەکان بە چەشنی هێڵێکی سەوز دیار بوون، کە تەپۆڵکە ڕەشباوەکان لە پشتیانەوە کەوتبوون. ئاوەکە شینێکی تۆخ بوو، هێندە تۆخ کە بەنەوشی دەنواند. کاتێک پیرەمێرد سەیری زەریای ژێر لاقەکانی دەکرد پلانکتۆنەکان و ڕووناکییەکی نامۆی کە لە تاو سارێژ دەبوو، لە ئاوە ڕەشەکەدا دەیدی.

گوریسەکانی دی کە لە ئاوە ڕەشەکەدا ون دەبوون و لە بینینی پلانتۆنەکان بەکەیف دەهات. چونکە ئەمە هەواڵی لە بوونی ماسی دەدا. ڕووناکییەکی نامۆ کە ئێستا خۆر لە بەرزاییەوە زۆرتر لە ئاوەکەی دەدا، دەینواند کە کەش خۆش دەبێت. هەورەکانی سەر وشکیش هەر ئەمەیان دەوت. بەڵام بازەکە لە چاو دوور کەوتبووە لەسەر ئاو شتێک بەدیارەوە نەبوو. مەگەر پەڵە زەردی گیا زەرياييەکانی ساراگۆسوی ڕەنگ بزرکاو و فوودانە ڕوو ئەرخەوانی درەوشێنەری بووکێکی زەریا کە لە نیزیک بەلەمەکەوە دەڕۆیشت. بووکی زەریا بە جوانی و بەچەشنی تۆقلەیەک بەسەر ئاوەکەوە دەڕۆیشت و پەلە ئەرخەوانی و کوشەندەکانی میترێک لە ئاوەکە بەدوای خۆی دەیکێشا.

پیرەمێرد گوتی:" ئاگوامالای سۆزانی."

لەو شوێنەوە کە هێواش دەستی دێنا بە ساوڵەکانیدا، سەیری ئاوی ژێر لاقی دەکرد و ماسییە وردەکانی دی کە بە ڕەنگی ئەو پەلە درێژانە کە لە نێوانیان و لە سێبەرێکی چکۆلەدا کە تۆقلەکە لەگەڵ خۆی دەیکێشا مەلەیان دەکرد. ژاری بووکی زەریا لەم ماسییانەدا کاریگەری نییە، بەڵام کاریگەری لەسەر مرۆڤەکان هەیە. هەرکات لەتێک لەم پەلە ئەرخەوانیە خلیسک و لینجانە بە گوریسێکەوە گیری دەکرد کە پیرەمێرد لەگەڵی خەریک بوو، دەست و باسکی لەو بلۆقانەی دەدا کە لە کاریگەری بەڕووە ژەهراوييەکان لەسەر لەش درووست دەبن. بەڵام ساز بوونی بلۆقە ژەهراوييەکانی ئاگوامالا بە چەشنی ڕاکێشانی قامچییەکی لە ناکاودایە.

تۆقلەی ڕووناکی بووکی زەریاییەکان جوانە، بەڵام ئەمە فێلباز و کەڵەکەبازترین بوونەوەری زەریایە. پیرەمێرد پێی خۆش بوو کە کیسەڵە گەورەکانی زەریا ئەوانی دەخوارد. کیسەل بووکی زەریایی دەدی، لە ڕووبەڕوویەوە دەهات وئەوکات چاوی دەبەست دەبووە قاوغ و بووکەکەی بە پەلەو کلکەکەیەوە دەخوارد. پیرەمێرد پێی خۆش بوو ببینێت کیسەڵەکان ئەوان دەخۆن، پێی خۆش بوو دوای فەرتەنە لە کەنارەکان لاق بخاتە سەریان دەنگی تەقینیان لە بن پێ نالەبارە و ڕشاڵ و ڕووشاڵەکانی ببیستێت.

پیرەمێرد کیسەڵە سەوزەکان و کیسەڵە هەڵۆ سەرەکانی کە هەم ناسک و تیژتر بوون و هەم گرانتر، خۆش دەویست. بە سووکییەکەوە سەیری کیسەڵە سەرکەرە گەورەو گەمژەکانی دەکرد. کە قاوغەکانیان زەردە و بەشێوەیەکی سەرسووڕ هێنەر نیزیکی دەکەن و بە خۆشیەوە چاوەکانیان دەبەستن و بووکە زەریاییەکان هەڵدەلووشن.

لەگەڵ ئەوەی سالانێک لە بەلەمی ڕاوی کیسەڵ ئیشی کردبوو، بە هیچ خورافەیەک سەبارەت بە کیسەڵەکان بڕوای نەبوو، دڵی بۆ هەموویان دەسووتا، تەنانەت بۆ خورتوومە سەوزەکان کە بەدرێژی بەلەمێک بوون. و تۆنێک کێشیان بوو. زۆرینەی خەڵک دڵیان بۆ کیسەڵ ناسووتێت. چون دڵی کیسەڵەکان چەن کاتژمێر دوای ئەوەیکە زگیان هەڵدڕی و گۆشتەکەیان لەت و کوت کرد هەر لێدەدا. بەڵام پیرەمێرد لەگەڵ خۆی گوتی، کە من چۆن دڵێکم هەیە و دەست و لاقەکانم بەچەشنی کیسەڵە. پیرەمێرد هێلکەی سپی کیسەڵەکانی دەخوارد، بۆ ئەوەی هێزی هەبێت. لە

بەهار هێلکەی کیسەڵی دەخوارد بۆ ئەوەی لە پاییز کە وەرزی ماسییە گەورە گەورەکانە هێزی زۆرتری بۆ ڕاو کردن هەبێت.

هەروەها هەموو ڕۆژێک لە بۆشکە گەورەی کوختەکە کە ماسیگرەکان کەرەسەکانی خۆیان لەوێ دادەنا، ئیستکانێک سێل، ڕۆنی جەرگی سەماسیی دەخواردەوە. هەر ماسیگرێک کە بیویستایە دەیتوانی لێی بخواتەوە. زۆرینەی ماسیگرەکان بە تامی جاڕز بوون، بەڵام خواردنی ئەم ڕۆنە لە هەستان لەو کاتژمێری ڕۆژە دژوارتر نەبوو. و بۆ هەڵامەت و نەخۆشی هەروەها بۆ تیژی چاویش چاک بوو.

ئێستا پیرەمێرد سەیری سەرەوەی خۆی کرد و باڵندەکەی دی کە خەریک بوو دیسان دەوری لێدەدا.

بەدەنگی بەرز گوتی:" ماسی بینیوە." هیچ ماسییە باڵندەیەک لە ئاوەکەوە نەهاتە دەرەوە و پۆلی چێشتە ماسییەکانیش بڵاو نەبوونەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی پیرەمێرد سەیری زەریای دەکرد، دۆلفینێکی چکۆلە لە ئاو هاتە دەرەوەو سووڕێکی خوارد و بەسەرەوە لە ئاوەکە چووە خوارەوە، دۆلفین لەبەر تاوەکەدا وەک زێو دەدرەوشاوە و دوای ئەوەیکە کەوتە ئاوەکە چەن دۆلفینی دیکەش یەک بەدوای یەک لە ئاوەکە دەرپەڕینە دەرەوە و بەهەر لایەکە هەڵبەز دابەزیان دەکرد و ئاوەکەیان شڵەژاند و بۆ ڕاو بازی گەورەیان دەدا. بەدەوری ڕاوەکەدا دەسووڕانەوەو بەرەو پێش دەیانبرد.

پیرەمێرد گوتی گەر ئەمانە زۆر بە خێرایی نەڕۆن من دەڕۆمە نێوانیان، و پۆلی ماسییەکانی سەیر کرد کە ئاوەکەیان بە جۆرێک

شڵەژاندبوو کە سپی دەنواند. و بازەکە ئێستا دەنیشتەوە، لە نێوان ڕاوەکان کە لە ترسا لە ئاو هاتبوونە دەرێ خۆی لە ئاوەکە دەدا.

پیرەمێرد گوتی:" مریشکەکان یاریدەرێکی گەورەی ماسیگرەکانن." لەو کاتەدا گوریسی پێشەوە، کە ئاڵقەکەی لەژێر لاقی ئەو دا بوو، کێشرا و ئەو سەوڵەکانی بەردا و بەو شێوەی کە گوریسەکانی توونتوند گرتبوو دەستی کرد بە کێشان، قورسایی ڕاکێشانی جووڵەی دۆلفینە چکۆلەکەی هەست دەکرد. لەرزانەوەکان زۆرتر بوو. گوریسەکەی کێشا و ژێر ملی شین و لاشانە زێڕینەکەی ماسییەکەی بینی. ئەوکات بە جووڵانەوەی دەست بەرزی کردەوەو لە تەنیشتی بەلەمەکە ڕایکێشا نێو بەلەمەکە، ماسی بە جەستەیەکی ڕێک و پێک و شێوە دوگی بە چاوە خڕ ودەرتۆقیوەکانی، کەوتە پێشەوەی بەلەمەکە، بە جووڵانەوەی خێرای کلکە ناسک و چالاکەکەی گیانی دا. پیرەمێرد لەسەر بەزەیی یەکی بەسەریدا کێشا و لاشەکەی خستە بەر سێبەری ژێر تەختەکە.

بەدەنگی بەرز گوتی:" ئاڵباکوورێ، چ ڕاوێکی گەورە. چوار کیلۆ دەبێت."

لەبیری نایات لەکەیەوە بڕیاری داوە بەدەنگی بەرز و لە تەنیای قسە بکات. لە ڕابردوو گۆرانی بۆ خۆی دەخوێند و جاری وا کە لە تاقمی ڕاوی کیسەڵ یان لە کەشتییە ماسیگرەکان شەوانە کە ئێشکچی بوو یان تەنیا سۆکانی پێ بوو گۆرانی دەخوێند، ڕەنگە لە کاتێکەوە کە کوڕەکە لەلای ڕۆیشتبوو خووی گرتبوو کە بەدەنگی بەرز قسە بکات. بەڵام لەبیری نەدەهاتەوە. ڕۆژگەلێک کە ئەو لەگەڵ کوڕەکە دەهاتن بۆ ڕاوی ماسی، زۆرتر کاتێک بەیەکەوە

قسەیان دەکرد کە پێویست بوو، شەوان و کاتژمێرگەلێک کە تووشی فەرتەنە دەبوون بەیەکەوە قسەیان دەکرد. لە زەریا بێ هۆ قسە نەکردن لە چاکییەکان بوو و پیرەمێرد هەمووکات چۆن باوەڕێکی بوو ئەم داب و نەریتەی بەجێ دێنا. بەڵام ئێستا بیرۆکەکانی بە دەنگی بەرز دەگوت چون کەسێک نەبوو کە لەبیستنیان جاڕز بێت.

بەدەنگی بەرز گوتی:" گەر خەڵک ببیستن کە من بەدەنگی بەرز قسە دەکەم وا ڕەنگە خەیاڵ کەن کە شێت بووم، بەڵام کێشە نییە، چون شێت نیم، دەوڵەمەندەکان ڕادیۆیان هەیە کە لەبەلەمەکە قسەیان بۆدەکات هەواڵی بەیسباڵیانی بۆ دەڵێ."

لەگەڵ خۆی گوتی ئێستا کاتی بیر کردنەوە لە بەیسباڵ نییە. ئێستا کاتی بیری شتێکەو بەس، ئەوەی کە من بۆی لەدایک بووم، دەوروبەری ئەم پۆلە دەبێت یەکێک لەو گەورانە هەبێت، من لەو ئاڵباکورەییانەی کەخەریکی ڕاو بوون دانەیەک بەڕەڵایانم گرت. بەڵام ئەمانە خەریک بوو بەرەو ئەو دوورانە دەڕۆیشتن و خێراش دەڕۆیشتن. ئەمڕۆ هەرچی لەسەر زەریا دەبینم خێرا دەڕوات، بەرەو باکووریش دەڕۆن، ئایا ئەم کاتە لە ڕۆژ بەم شێوەیە؟ یان یەکێک لە نیشانەکانی هەوایە کە من نایانناسم؟

ئێستا ئیدی سەوزی کەنارەکانی نەدەدی، بەڵکوو تەنیا لووتکەی تەپۆڵکە شینکییەکانی دەدی، کە سپییان دەنواند. دەڵێی بەفر لەسەریان بوو و هەورەکان، بە چەشنی کێوە بەرزە بەفرگرەکان لەسەرەوەی تەپۆڵکەکانەوە بوون، زەریا زۆر ڕەش بوو، ڕووناکی لە ئاودا ڕەنگەلی جیاوازی درووست کردبوو هەزاران هەزار پلانکتۆن لە ڕووناکی تاوی سوور هەڵگەڕاو ون ببوون، لە ئاوێکدا

کە ئێستا هەزار قوولایی بوو پیرەمێرد ڕەنگدانەوە گەورەکانی لە قووڵی و شینی دەیدی.

تۆنەکان_ ماسیگرەکان تەواوی ماسییەکانی ئەم ڕیزەیان تۆن ئەژمار دەکرد، و تەنیا ناوی درووستیانیان کاتێک بەکار دێنا کە خەریک بوون دەیانیانفرۆشت یان لەگەڵ چێشتە ماملەیان پێ دەکردن. ماسییە تۆنەکان دیسان چبوونە قوولایی ئاو، تاو سوور هەڵگەڕابوو پیرەمێرد لە پشت ملی هەستی پێ دەکرد و هەستی دەکرد کە لەگەڵ ئەوەی سەوڵی لێدەدا ئارەق لە پشتییەوە شۆڕە دەکات و پێیدا دێتە خوارەوە.

لەگەڵ خۆی گوتی دەتوانم بەلەمەکە بە تەوژمی ئاوەکە بسپێرم و بۆخۆم بخەوم، گوریسێک بە ئەنگوستێکی لاقمەوە گرێ بدەم کە وە ئاگام بێنێتەوە. بەڵام ئەمڕۆ هەشتاو پێنج ڕۆژە. ئەمڕۆ دەبێت ڕاوێکی چاک بکەم.

لەو ساتەدا، هەرئەوەیکە بە چاو بە گوریسەکاندا هاتەوە، بینی کە یەکێک لەو لقانە سەری خێرا بۆ نێو ئاوەکە شۆڕ کردەوە.

گوتی:" ئەها،" و سەوڵەکانی بە لێهاتووییەکەوە لە بەلەمەکە هاویشت کە هیچ جووڵەیەک بە بەلەمەکە نەدرا. دەستی برد و گوریسەکەی گرت و هێواش لە نێوان قامکی دۆشاومژەو و کەڵەموستی دەستە ڕاستەکەی ڕایگرت. هەستی بە ڕاکێشان یان قورساییەک نەکرد. ئەوکات بوو کە تەکانێکی دیکە هات. ئەمجار ڕاکێشانێک بوو دوو شکە، نە توووند و تۆڵ نە بە هێز، پیرەمێرد بە باشی دەیزانی کە چییە، سەد باڵا خوارتر، ماسییەکی مارلین

خەریک بوو ساردینەکانی سەرقولاپ و لاسقی قولاپەکەی کەلەسەری ماسییە تۆنە چکۆلە هاتبوونە دەرەوە دەخوارد.

پیرەمێرد گوریسەکەی بە هێوەری ڕاگرتبوو، و بەدەستی چەپ بە هێواشی ئەوی لە جێ بەندی لقکە کردەوە، ئێستا دەیتوانی گوریسەکە لە نێوان قامکەکانی جێبەجێ کات بێ ئەوەی ماسییەکە هەستی پێ بکات.

لەگەڵ خۆی گوتی لەشوێنێک بەم دوورییە لەم کاتەی ساڵدا دەبێت ماسییەکی گەورە بێت. بخۆ، ماسی بخۆ، توخودا بخۆ، زۆر تازەیە، تۆش لەو ئاوە ساردە تاریکە شەشسەد باڵا لە ژێر لاقەکانی منی، سووڕێکی دیکە لە نێو تاریکی بدەوەو بگەڕێوەو بخۆ.

ڕاکێشانی هێواش و ناسکی هەست پێ کرد، دوای ئەو ڕاکێشانێکی توندتر کە دەکرێ نیشانەی ئەوە بێت کە لێکردنەوەی سەری ساردین لە قولاپەکە ئاستەمە، دوای ئەو هیچ هەواڵێک نەبوو.

پیرەمێرد بەرز گوتی:" دەی، سووڕێکی دیکە بدە و بێ بۆنی کە، بزانە چ بۆنێکی خۆشی لێدێت، باشی بخۆ، دوای ئەویش ماسی تۆن هەیە، پتەو سارد و بەتام، شەرم مەکە ماسی، بیخۆ."

بە گوریسی نێوان قامکەکانی چاوەڕوان بوو، هەم ئەم گوریسە هەم ئەوی دیکەی لەژێر چاو بوو، چونکە ئەگەری بوو ماسی بەم لاو لادا بڕوات، ئەوکات ڕاکێشانێکی کزی هەست کرد.

پیرەمێرد بەرز گوتی:" خەریکە دەیخوات، هیوادارم کە بیخوات."

بەڵام نەیخوارد، ماسی ڕۆیشت و پیرەمێرد هەستی نەکرد.

گوتی:" نەڕۆیشتووە، خودا دەزانێ نەڕۆیشتووە، خەریکە دەسووڕێتەوە. ڕەنگە جارێکی دیکەش بەر قولاپ کەوتووە، ئێستا شتێکی وەبیر دەێتەوە."

ئەوکات جووڵانەوەیەکی هێواشی گوریسەکەی هەست کرد و شاگەشە بووە.

گوتی:" تەنیا دەیویست سووڕێک بدات، ئێستا دەیخوات."

ڕاکێشانێکی هێواشی هەست دەکرد و کەیف خۆش بوو. ئەوکات هەستی بە شتێکی ڕەق و دژوار کرد. کە قورساییەکەی جێ باوەڕ نەبوو. ئەمە کێشی ماسی بوو. پیرەمێرد گوریسی پێدەدا و پێی داو ئاڵقەی هەوەڵ لە دوو ئاڵقە زیادییەکەی کردەوە. هەروەها کە گوریسەکە لە نێوان قامکەکانی پیرەمێرد دەچووە خوارەوە پیرەمێرد هەستی بە قورسایی ماسییەکە دەکرد هەرچەن گوشاری قامکەکانی هێندە زۆر نەبوو.

گوتی:" لەو ماسییە چاکانەیە، ئێستا لە باری پانی لەنێو دەمیدایە، خەریکە دەیبڕێ."

لەگەڵ خۆی گوتی دەسووڕێت و دەیخوات، ئەمەی بەرز نەگوت چونکە دەیزانی کە مرۆڤ بیری باش بەدەنگی بەرز بیڵێت ئەو شتە ڕەنگە ڕوو نەدات. دەیزانی کە ئەم ماسییە چەندە گەورەیە. لەگەڵ خۆی گوتی لە تاریکی ماسی تۆنەکەی لەباری پانی لە دەمی گرتووە، خەریکە دوور دەبێتەوە. لەو ساتەدا هەستی کرد کە ماسییەکە لە جووڵە کەوتووە. بەڵام ئێستاش قورساییەکەی هەیە، ئەوکات کێشەکەی زۆرتر بوو. پیرەمێرد گوریسی زۆرتری

بۆ شل کرد، گوشاری قامکەکانی ساتێک زۆر کرد، هستی کرد کە قورساییەکە زۆرتر دەبێت و ڕاست بەرەو خوارێ دەڕوات.

گوتی:" خواردی خواری، ڕێگا دەدەم باشتر بیخوات."

گوریسی نێوان قامکەکانی شل کرد و لەو کاتەشدا دەستی چەپی بۆ خوارەوە درێژ کرد و کۆتایی وێڵی دوو ئاڵقە زیادییەکەی بە بازنەی دوو ئاڵقەکەی دیکەوە گرێ دا. ئێستا حازر بوو سێ ئاڵقەی چل باڵایی گوریس هەبوو کە دەیتوانی بە خێرایی بەکاری بێنێت جگە لە گوریسێک کە بەدەستییەوە بوو.

گوتی:" کەمێک زۆرتر بخۆ، باش بخۆ."

لەگەڵ خۆی گوتی جۆرێک بیخۆ کە دەمی قولاپەکە بچێتە دڵتەوەو گیانت بکێشێت. هێواش وەرە سەرەوە با نێزەکە بکەم بە جەستەتا، ئامادەی؟ باشت خواردووە؟

بەرز گوتی:" ئێستا "و بە هەر دوو دەستی گوریسەکەی تووند کێشا، میترێک لە گوریسەکەی هێناوە بۆ لای خۆی. دیسان چەن جاری دیکە بەدوای یەکا کێشای هەر جاریش بە تەواوی هێزی باسکەکانی و ئەندامی کە ئێستا بەسەر بەلەمەکەوە قیت ڕاوەستابوو، بەم دەست و ئەو دەستەی دەیکێشا.

هەواڵێک نەبوو. تەنیا ماسی هێواش دوور کەوتەوەو پیرەمێرد نەیتوانی تەنانەت بەشە قامکێک هەڵیکێشێ. گوریسە تووند و تۆڵەکەی بۆ ماسییە قورسەکان گرتبووە، پیرەمێرد ئەوی بە پشتی خۆیەوە گرت و هێندە کێشا کە ئەوەی ئەو پێیەوە بوو لێی چۆڕا. ئەوکات دەنگی خسە خسێکی سووک و کز لە ئاوەکە بەرزەوە

بوو، پیرەمێرد لاقی بە تەختەی سنگەکەوەنا و گوریسەکەی کێشا، و بە پێچەوانەی کێشانی گوریسەکە نووشتایەوە. بەلەمەکە هێواش بەرەو باکووری ڕۆژئاوا وەڕێ کەوت.

ماسی بەردەوام بەرەو پێشێ دەچوو ئەوانیش هێواش بەسەر ئاوە مەندەکە دەڕۆیشتن. چێشتەکانی دیکە هەروا لە نێو ئاوەکە بوون بەڵام کارێک نەدەکرا.

پیرەمێرد بەرز گوتی:" بریا کوڕەکەم لەگەڵ دەبوو، ماسییەکە خەریکە من دەکێشێت و دەبات، منیش بوومەتە گوڵ مێخی ئەم گوریسە، دەتوانم گوریسەکە ببەستمەوە، بەڵام دەترسم بپچڕێ، دەبێت تا هێزم هەیە ڕایگرم، هەرکات پێویست بوو بۆی شل کەم، خودا شووکر خەریکە بەرەو پێش دەچێت و بەرەو خوارێ ڕۆ ناچێت.."

گەر دای لە سەری بەجێگای بەرەو پێش چوون بچێتە خوارێ نازانم دەبێ چی بکەم. گەر چووە خوارێ و مرد نازانم دەبێ چی بکەم. بەڵام کارێکی پێ دەکەم، زۆر کار هەیە دەتوانم لەگەڵی بکەم.

گوریسەکەی بە پشتییەوە گرتبوو و خوار ڕۆیشتن و بەدەوام پێش چوونی بەلەمەکەی بەرەو باکووری ڕۆژئاوا سەیر دەکرد.

لەگەڵ خۆی گوتی ئەمە دەکوژی، تا هەتایە ناتوانێ ئەم کارە بکات.

بەڵام چوار کاتژمێر دواتر ماسی بەردەوام یەک هەناسە بەرەو زەریا دەڕۆیشت و بەلەمەکەی بەدوای خۆی دەکێشا،

پیرەمێردیش بەردەوام توووند لەسەر جێگاکەی ڕاوەستا بوو گوریسەکەی بە کۆڵەوە بوو.

گوتی:" نیوەڕۆ بوو گرتم. ئێستاش نەمتوانیوە کە بیبینم"

پێش لەگرتنی ماسییەکە کڵاوە قامیشییەکەی توووند لەسەری دانابوو، ئێستاکە کڵاوەکە ناوچاوانی قرنجادبوو، بۆیە هەستی بە جاڕزی دەکرد. توونی بوو و هێواش بەشێوەیەک کە گوریسەکە نەجووڵێتەوە ئەژنۆی دادا و تا ئەو شوێنەی کە دەیتوانی بەرەو پێشێی بەلەمەکە خۆی خزاند و دەستێکی بەرەو گۆزەی ئاوەکە کێشا، درگاکەی کردەوەو بڕێکی خواردەوە، دوای ئەو پاڵی بە تەنیشت بەلەمەکە دایەوە، لەسەر کۆڵەک و بچارۆگە هەڵنەکراوەکەی دانیشت و هەوڵی دا بیر نەکاتەوە تەنیا خۆڕاگر بێت.

دواتر سەیرێکی پشت سەری کرد و بینی  وشکی ون بووە. لەگەڵ خۆی گوتی ئەمە جیاوازی نییە، بە ڕووناکی هاوانا دەتوانم بگەڕێمەوە، هێستا دوو کاتژمێری دیکە ماوە بۆ ئەوەی تاو بکەوێت، ڕەنگە تا ئەوکات ماسییەکە بێتە سەرەوە، گەر نەهات لەگەڵ مانگ دێتە سەرەوە، گەر هەر نەهات ڕەنگە لەگەڵ تاو بێتە سەرەوە. هیچ شوێنێک لەلەشم سڕ نەبووە و ئێستاش هێزم تێدا ماوە. ئەوە کە قولاپەکەی بەدەمەوەیە. بەڵام بەم ڕاکێشانەیەوە لەو ماسییە بەخۆیانەیە. ڕەنگە دەمی توووند لەسەر سیمی قولاپەکە بەستووە، بریا دەمدی. بریا یکجار دەمدی کە برانم لەگەڵ چی هاتوومەتە مەیدان.

تا ئەو ڕادەیەی کە پیرەمێرد دەیتوانی لە ئەستێرەکان تێبگات، ماسی ئەوشەوە ڕێگاکەی خوار نەکردەوە. دوای کەوتنی خۆر کەش سارد بوو، و ئارەق لەسەر پشت و دەست و لاقەکانی پیرەمێرد بە وردی وشکەوە بوو کرێشی هەڵدا. لە کاتی ڕۆژ ئەو تەلیسەی کە لەسەر زەرفی چێشتەکان دایدەنا لەبەر تاو بلاوی کردبووە کە وشک بێتەوە. دوای کەوتنی تاو ئەوی بەدەوری ملی خۆیەوە بەست. بە شێوەیەک کە تەلیسەکە بە پشتییەوە هەڵواسرابوو. بە ئاگاداریی و زۆر بە وردی ئەوی بۆ ژێر گوریسەکە برد کە بە کۆڵیەوە بوو. تەلیسەکەی کردە باڵنجی گوریسەکە و ڕێگایەکی دۆزییەوە کە خۆی بە تەختەکە پاڵ دادەتەوەو بەرەو پێشێ بنووشتێتەوە. بەشێوەیەک ئاسوودە بێت. ئەم دۆخە تەنیا برێک ناخۆش بوو، بەڵام پیرەمێرد بە ئاسوودەی دەزانی دەتوانێ لەو دۆخەدا بمێنێتەوە.

لەگەڵ خۆی گوتی:" نە من دەرەقەتی ئەو دێم و نە ئەویش ئی من، تا ئەو بەم شێوەیە دەڕوات هەر ئەمەیە کە هەیە."

جارێک ڕاوەستا و لە تەنیشتی بەلەمەکەوە بەرەو زەریا میزی کرد و سەیری ئەستێرەکانی دەکرد. تێر سەیری خۆی کرد، گوریس لە شانەکانیەوە بەرەوخوار یەکڕاست بە شێوەی شەونمایەک ڕووناک لە ئاو دەدرا. ئێستا هێواشتر دەڕۆیشت. ڕووناکی هاوانا هێندە بەهێز نەبوو . ئەو دەیزانی تەوژمی ئاو خەریکە ئەوان بەرەو ڕۆژهەڵات دەبات. لەگەڵ خۆی گوتی گەر ڕووناکی هاوانا تەواو بێت دەبێ بەرەو ڕۆژهەڵاتێکی قووڵ ڕۆیشتبێتین. چونکە گەر هێڵی ڕۆیشتنی ماسی هەر ئەمە بێت دەبێ تا چەن کاتژمێری دیکە ڕووناکی ببینین. نەمزانی ئەمڕۆ دەرئەنجامی کێبەرکێی

گەورەی بەیسباڵ چی بوو. چ باش دەبێت مرۆڤ کاتی کار ڕادیۆی هەبێت. دواتر لەگەڵ خۆی گوتی هەمووکات خەریکی بیر کردنەوەبە. هەمووکات مێشکت بە بیر کردنەوە خەریک کە. نەچی کەرێتی بکەی.

ئەوکات بەرز گوتی:" بریا کوڕکە لەگەڵم دەبوو. هەم یاریدەر بوو هەم ئەمەی دەدی."

لەگەڵ خۆی گوتی هیچکەس نابێت لە سەردەمی پیری تەنیا بێت. بەڵام ڕێ چارە نییە، بیرم بێت ماسییە تۆنەکان پێش ئەوەی خراپ بن بخۆم. تا هێزم هەبێت.لەبیرت بێ بەیانی بەهەر شێوەیەک ماسیەکە بخۆی، لەبیرت بێ.

لە نیوەشەودا دوو دۆلفین هاتنە تەنیشت بەلەمەکە و پیرەمێرد دەنگی سووڕ خواردن و جووڵانی دەمیانی دەبیست، دەتوانی دەنگی نێرییەکە لە دەنگی مێکە لێک کاتەوە.

گوتی:" بوونەوەرێکی چاکن، بەیەکەوە گەمەو گاڵتە دەکەن. یەکتریان خۆش دەوێت، ئەمانەش وەک ماسییە باڵندەکان هاوڕێمانن."

ئەوکات بەزەیی بەو ماسییەدا هات وا ڕاوی کردبوو. لەگەڵ خۆیا گوتی کە ئەمە ماسییەکی چاک و سەیرە و دەزانێ من چەندە پیرم، تا ئێستا ماسی بەم بەهێزییەم نەگرتووە. ماسی بەم سەیروسەمەرییە نەگرتووە، ڕەنگە دەزانێ کە نابێ لە ئاوەکە دەرپەڕێتە دەرەوە، گەر پەڕی یان خۆی لێ هار بوو، ماڵوێرانم دەکات. بەڵام ڕەنگە پێش ئەمە چەن باری دیکە بە قولاپەوە بووە،

دەزانێ کە ڕێگای شەڕ کردنی هەر ئەمەیە. لە کوێ دەزانێ کە تەنیا ڕووبەڕووی کەسێک بووەتەوە، یان ئەوەیکە پیرەمێردە؟ بەڵام ماسییەکی سەیر گەورەیە، گەر گۆشتەکەی چاک بێت لە بازاڕ پارەییەکی زۆر دەکات. چێشتەکەی وەک ماسی نێر خوارد ڕاکێشانەکەشی شێوەی ماسی نێر دەدات. لەشەڕ کردنەکشیا هێمایەک لە ترس نابینم، نازانم پلانێکی هەیە یان ئەویش وەک من ماوەتەوە؟

بیری کاتێک کەوتەوە کە یەکێک لە جووتێک مارلینی ڕاو کردبوو. ماسییە نێرەکە هەمووکات ڕێی دەدا کە ماسییە مێوەکە بخوات. ماسییە بەند کراوەکە، ماسییە مێوەکە، هەوڵێکی دژوار و ترس هێنەری دا و لە هەناسە کەوت. لە تەواوی ئەوکاتەدا ماسییە نێرەکە لەگەڵی بوو، لەسەر گوریسەکەوە تێپەڕ دەبوو، لەسەر ئاو بەدەوری ماسییە مێوەکە دەسووڕاوە، هێندە نیزیکی ماسییە مێوەکە مەلەی دەکرد کە پیرەمێرد ترسا نەکا بە کلکە شێوە داسەکەی کە لە ئاست و بەچەشنی داس تیژ بوو، گوریسەکە ببڕێت. پیرەمێرد بە گۆچان و تێڵاەکەی لە مێوەکەی دا لێوارە هەسان ئاسای لمۆزی گرت. هێندەی بە تەپڵی سەری دا ڕاکێشا، کە ڕەنگی گەڕاو بە شێوەی جیوەی پشت ئاوێنە دەرهات. ئەوکات بە هاوکاری کوڕەکە ماسییەکەی هەڵکێشا، ماسییە نێرەکە هەروا لە تەنیشت بەلەمەکە بوو. کاتێک پیرەمێرد خەریک بوو گوریسەکەی کۆ دەکردەوە و نێزەکەی حازر دەکرد ماسییە نێرەکە لە پەنای بەلەمەکە هەڵبەزییەوە بۆ ئەوەی ببینێ مێوەکەی لە کوێیە، دواتر کەوتەوە نێو ئاوەکە. باڵگەلی بەنەوشی کە هەر ئەو باڵە چکۆلانەی پێشەوەی بوون کردییەوە و تەواوی هێڵە

بەنەوشەکانی دەرکەوتن. پیرەمێرد بیری کەوتەوە ماسییەکی جوان بوو هەڵای نەکرد.

پیرەمێرد بە خۆی گوت، ئەمە تاڵترین شتێکە کە لەوان لەبیرم دێت. کوڕەکەش تێک چبوو و لە ماسییەکە داوای لێبووردنی کرد و خێرا زگی هەڵدڕی.

پیرەمێرد بەرز گوتی:" بریا کوڕێژەکە لێرە دەبوو" پاڵی بە تەختەی پێشووی بەلەمەکە داوە، هێزی ماسییەکەی لە ڕێگای گوریسێک کە بەشانیەوە بوو هەست کرد، کە ڕاست بەرەو ئەو ئامانەجەی وا هەڵی بژاردبوو دەڕۆیشت.

پیرەمێرد بەخۆی گوت، بە هۆی هەوڵە نەشیاوەکەی منەوە ناچار بوو ئەم ئامانجە هەڵبژێرێ. ئامانجی ماسییەکە ئەوە بوو کە بەدوور لە داو بەند و خراپییەکان و پیسییەکان لە قووڵایی ئاوی تاریک بمێنێتەوە. ئامانجی من ئەوە بوو کە بڕۆمە شوێنێک کە هیچ کەسێک نەڕوات و بیدۆزمەوە. ئێستا بەیەک گەیشتووین لە نیوەڕۆ تا ئێستا بەیەکەوە بووین، و هیچ کەس نییە کە بە هانای هیچ کاممانەوە بێت.

بەخۆی گوت ڕەنگە من نەدەبوو ببم بە ماسی گر. بەڵام من هەر بۆ ئەم کارە لەدایک بووم، هەر ئەوەیکە ئاسمان ڕووناکی بە خۆی دی ماسییە تۆنەکە بخۆم.

هێندەی نەمابوو تاو لە قوژبنەکان سەر بکێشێتە دەرەوە کە شتێک یەکێ لە چێشتەکانی پشتەسەری پیرەمێردی ڕفاند. پیرەمێرد دەنگی شکانی لقەکەی بیست. و گوریس لەسەر لێواری

بەلەمەکە بەخێرایی ڕۆیشت. لە تاریکی چەقۆی غەڵافدارەکەی کێشا، تەواوی گوشاری ماسییەکی بە شانی چەپی داو بۆ دواوە نووشتاوە، گوریسی لەسەر لێواری بەلەمەکە بڕی. دوایی ئەو گوریسەی کە نیزیکتر بوو بڕی، و لە تاریکی سەر ئاڵقە زیادییەکانی بەیەکەوە گرێ دا. یەکدەستی، شارەزایانە کاری دەکرد لاقی لەسەر ئاڵقەکان داناو کێشای و توندی کرد، ئێستا شەش ئاڵقەی زیادەی بوو، دوو ئاڵقە لە هەرکام لەو دوو چێشتەی کە درێژەکەیان بڕی بوو دوو دانە لەوانەی وا ماسیەکەی گرتبوو، تەواوی ئەوانە بەیەکەوە گرێ درابوون.

بەرز گوتی:" بریا کوڕەکە لەگەڵم دەبوو."

بەڵام لەگەڵ خۆی گوتی، کوڕەکەت لەگەڵ نییە. بۆ خۆت تەنیای، چ تاریک بێت، چ نەبێت، باشترە ئەو گوریسە کۆتاییە چاک کەی، بیبڕە، ئەو دوو ئاڵقە زیادییەش بەیەکەوە گرێ بدە.

ئەم کارەی کرد، لە تاریکدا کارێکی ئاستەم بوو. و جارێک ماسییەکە جووڵەیەکی کرد کە بە ئێجگاری پیرەمێرد کەوت و ژێر چاوی هەڵدڕا. خوێن لەسەر گۆنای بڕێک هاتە خوارەوە بەڵام نەگەیشتوو بە چەناکەی ڕاوەستا و وشک بوو. پیرەمێرد خۆی بۆ پێشەوەی بەلەمەکە گەیاند و پاڵی داوە. شوێنی تەلیسەکەی ڕێک کرد و گوریسەکەی بە وردی جێبەجێ کرد، بەشێوەیەک کە چووە شوێنێکی دیکەی شانی، هەر واکە بە شانەکانی لەنگەری گرتبوو ڕاکێشانی ماسییەکەی بە وردی هەست پێ دەکرد. دواتر بە دەست بەرەو پێش چوونی بەلەمەکەی تاقیکردەوە.

لەگەڵ خۆی گوتی نازانم ئەم جووڵەیەی لە چی بوو. ڕەنگە گوریس لە بەڕزاییەکەی گەورەی پشتی دەرچووە. پشتی ئەو ڕەنگە بە ئاستی پشتی من نەیەشێ، بەڵام ناتوانێ ئەم بەلەمە تا هەتایە بکێشێت هەرچەندەش گەورە بێت. ئێستا هەر شتێک کە ڕەنگە کێشە بنێتەوە لەسەر ڕێگام لا بردووە، گوریسی زیادەشم هەیە، ئیدی چی دیکەم دەوێ؟

بەدەنگێکی بەرز و هێوەر گوتی:" ماسی تا گیانم هەیە لەسەرت ڕاوەستاوم."

پیرەمێرد لەگەڵ خۆی گوتی، ڕەنگە ئەویش لەسەر من ڕاوەستاوە، چاوەڕێی ڕووناکی بوو. ئێستا کەشی پێش لە کازیوە سارد بوو و پیرەمێرد خۆی بە تەختەکەوە نووساند کە گەرم دا بێت. لەگەڵ خۆی گوتی تا کاتێک ئەو دەتوانێ منیش دەتوانم. لەهەوڵ تیشکدا گوریسەکەی دی کە لە ئاوەکە ڕۆ دەچوو. بەلەمەکە بەردەوام پێش دەچوو، لێواری خۆر لە شانی ڕاستی پیرەمێردوە هەڵات.

گوتی بەرەو باکوور دەڕوات. بەخۆی گوت ڕەنگە تەوژمی ئاو زۆر ئێمەی بەرەو ڕۆژهەڵات بردبێت. بریا لەگەڵ تەوژمی ئاو دەگەڕایەوە. گەر دەگەڕایەوە دەردەکەوت هیلاک بووە.

تاو کە هاتە سەرەوە پیرەمێرد تێگەیشت ماسییەکە هیلاک نەبووە. تەنیا هێمایەکی چاکی دی. خواری گوریسەکە پیشانی دەدا کە ماسییەکە لە قووڵاییەکی کەمتر مەلە دەکات. ئەمە بەو مانا نەبوو کە لە ئاوەکە دەپەڕێتە دەرەوە بەڵام ئەگەری هەبوو. دەیتوانی ئەوەش ڕوو بدات.

پیرەمێرد گوتی:" با  هەڵبەزێت، هێندەم گوریس هەیە کە دەرەقەتی بێم."

لەگەڵ خۆی گوتی گەر گوشاری گوریسەکە زۆرتر بکەم ئازاری بۆ بگات و بپەڕێتە دەرەوە. ئێستا کە هەوا ڕووناک بووە ڕێگا بدە بپەڕێت و پشتی پڕ لە هەوا بکات بۆ ئەوەی نەتوانێ بڕوات و لە بن ئاو بمرێت.

هەوڵی دا گوشارەکە زۆرتر بکات، بەڵام گوریسەکە لەو ساتەیەوە کە ماسییەکەی بە قوولاپەوە کردبوو هێندە کێشرابووە کە شتێک نەمابوو بپچڕێت و پیرەمێرد چون بۆ پشتەوە خۆی گرتبووە کە گوریسەکە بکێشێت، تووند بوونەکەی هەست کرد زانی کە ناتوانێ لەمە زۆرتر گوشار بخاتە سەری. بە خۆی گوت هیچکات نابێ بیجووڵێنمەوە. هەر جووڵەیەک برِگەیەک کە قولاپەک سازی کردبوو بڵاوتری دەکرد، کاتێ کە ماسی لە ئاوەکە بپەڕێتە دەرەوە ئەگەری هەیە قولاپەکە بەجێبێڵێت. لەهەر حاڵدا خۆر دەرهاتووە و منیش باشترم، ئەمجارەش ناچار نیم سەیری خۆر بکەم.

لەتە گیایەکی زەرد بە گوریسەکەوە نووسابوو، بەڵام پیرەمێرد دەیزانی کە ئەم گیایە تەنیا گوریسەکە قورستر دەکات شاگەشە بووە. ئەمە هەر ئەو گیای زەردی کەنداو بوو کە شەو دەدرەوشایەوە.

گوتی:" ئەی ماسی زۆر لە لام ئازیزی زۆریش ڕێزداری بەڵام تا ئەوڕۆ تەواو نەبووە کارت ئێجگاری دەکەم و دەتکوژم."

لەگەڵ خۆی گوتی هیوادارم.

باڵندەیەکی چکۆلە لە باکوورەوە بەرەو بەلەمەکە دەهات. زۆر لە خوارەوە دەفڕی، پیرەمێرد دی کە باڵندەکە زۆر هیلاکە.

باڵندەکە بە لێواری بەلەمەکە گەیشت و نیشت، دوایی لەدەور سەری پیرەمێرد ڕۆیشت و لەسەر گوریسەکە نیشتەوە کە ئاسوودەتر بوو.

پیرەمێرد لە باڵندەکەی پرسی:" تۆ چەنساڵتە؟ جاری هەوەڵتە؟"

پیرەمێرد کە قسەی کرد، باڵندەکە سەیری کرد. هێندە هیلاک بوو کە نیگای بۆ لای گوریسەکە وەرنەگێڕا، هەر بەو شێوەی کە پەنجە ناسکەکانی گوریسەکەی گرتبوو لەسەری دەنووشتایەوە و ڕاست دەبوو.

پیرەمێرد پێی گوتی:" گوریسەکەی تووند و تۆڵە. زۆریش. دوێشەو کە با نەهات، تۆ بۆ هێندە هیلاکی؟ مریشکەکانیش، مریشکی ڕابردوو نین"

بیری لە هەڵۆکان کردەوە کە دێنە زەریا بۆ دۆزینەوەیان. بەڵام سەبارەت بەمە هیچی بە باڵندەکە نەگوت. چون بەهەر شێوە لە زمانی تێناگات. خۆی بەزوویی تێدەگات هەڵۆ چۆن باڵندەیەکە.

گوتی:" باڵندە، هیلاییەکەت دەرکەو دواتر وەک باقی مرۆڤ و مریشک و ماسییەکان بچۆ بەلای ژیانتەوە."

قسە کردن بوێری دەکرد، چونکە دوێشەو پشتی بریندار ببوو و ئێستاش ئازاری هەبوو.

گوتی:" باڵندە، گەر دەتهەوێ لە ماڵی من بمێنی، بمێنە، ببوورە ناتوانم  چارۆگەکە بکێشم، بەم کزە بایە کە خەریکە دێت بتبەمە کەنار، میوانم هەیە."

لەو ساتەدا لەناکاودا ماسی جووڵەیەکی کرد کە پیرەمێردی کێشاو بەسەر تەختەکەیدا سەرەو نوخنی کرد، بەشێوەیەک گەر پیرەمێرد خۆی نەگرتبوو بڕێک لە گوریسەکەی بۆ شل نەکردبوو دەکەوتە نێو زەریا.

کاتێک گوریس جووڵابووە، باڵندەکە فڕی بوو پیرەمێرد تەنانەت ڕۆیشتنەکەی نەدیبوو. بە دەستی ڕاستی بە ئاگاوە گوریسەکەی هەڵسەنگاند، دی کە لە دەستیەوە خوێن دێت.

بەرز گوتی:" گەوایە شتێک ئەزیەتی کردووە." گوریسەکەی ڕاکێشا بەڵکوو ماسییەکە بگەڕێنێتەوە. کە دی هێندەی نەماوە گوریسەکە بپچڕێت، دەستی ڕاگرت. خۆی بە گوشاری گوریسەکەوە گرتەوە.

گوتی:" ماسی ئێستا دەزانی چی دەکێشی. منیش هەروەها، خوداش دەزاێ. " سەیری دەور و بەری کرد بۆ ئەوەی چۆلەکەکە ببینێت، چون دەیویست لەگەڵی قسە کات، باڵندەکە ڕۆیشتبوو.

پیرەمێرد بیری کردەوە ماوەیەکی زۆر نەیتوانی ئۆقرە بگرێ، بەڵام ئەو شوێنە کە دەڕۆی هەوا خراپترە، تا دەگاتەوە بە کەنارەکان. چون ڕێگام دا ماسی هەر بەو جووڵەیە دەستم ببڕێت.؟ وادیارە خەریکم سووک و چرووک دەبم. ڕەنگە سەیری

ئەو باڵندەیەم دەکرد، ئاگام لای ئەو بوو، ئێستا ئاگادارتر دەبم، دواتریش دەبێت ماسییە تۆنەکە بخۆم کە هێزم بێت.

بەرز گوتی:" بریا کوڕەکە لێرە دەبوو، بریا بڕێکم خوێ دەبوو."

قورسایی گوریسەکەی خستە سەر شانی چەپی و بە وردی چۆکی دا و دەستی لە نێو ئاوەکە شۆرد پتر لە خولەکێک لە ئاوەکە هێشتیەوەو. نیگای لە خوێنێک کە بە دەستیدا دەهاتە خوارەوە و لە بزاڤی ئاوەکە بەسەر دەستیەوە و لە پێش چوونی بەلەمەکە، بڕیبوو.

گوتی:" خێراییەکەی زۆر کەمەوە بووە."

پیرەمێرد حەزی دەکرد دەستی زۆرتر لە ئاوە سوێرەکە بهێڵێتەوە. بەڵام لە جووڵانەوەی لە ناکاوی بەلەمەکە دەترسا، هەستاو قیتەوە بوو. دەستی بەرزەوە کرد و بەرەو خۆر گرتی. تەنیا خشاندنی گوریسەکە پێستەکەی قرچاندبوو. بەڵام بڕاوەکە لە شوێنێکی ئەوتۆی دەستی نەبوو. تا کارەکە کۆتایی پێ نەهاتووە پێویستی بە دەستەکانیەتی پێی خۆش نەبوو ئێستا کارەکە دەستی پێ نەکردووە دەستی بریندار بێت.

کاتێ دەستی وشکەوە بوو گوتی:" ئێستا دەبێت ئەم ماسییە تۆنە چکۆلە بخۆم، دەتوانم بە گۆچانەکە بیکێشمە پێشەوە هەر لێرە ئاسوودە بیخۆم."

ئەژنۆی دا و ماسییە تۆنەکەی بە گۆچانە سەر نێزەیەکەی لە بن تەختەکە دەرهێنا، بە شێوەیەک لە ئاڵقەکان گیر نەکات. دیسان گوریسەکەی دا بە شانەی چەپی و شانەو دەستی چەپی ڕاست

گرت و ماسییە تۆنەکەی لەسەرە نێزەکوە هەڵگرت و گۆچانەکەی لە شوێنی خۆی دانا. ئەژنۆیەکی لەسەر ماسییەکە دانا، چەن بڕگە گۆشتی لە لە درێژایی پشتی تا ژێر زگی ماسییەکە بڕی. کاتێ شەش بڕگەی بڕی، ئەوانی لەسەر تەختەکە پان کردەوە چەقۆکەی بە پانتۆڵەکەیدا کێشا و کلکی لاشە ماسییەکەی گرت و فڕی دا نێو زەریا.

گوتی:" گومان ناکەم بتوانم ماسییەک بە تەواوی بخۆم." یەکێک لە بڕگەکانی بە چەقۆ دوو کوت کرد. ڕاکێشانی سفت و بەردەوامی گوریسەکەی هەست دەکرد و دەستی چەپی سڕ ببوو، دەستی گوریسەکەی توونددەکێشا، و پیاو بە ئاڵۆزیی و تێک چوونێکەوە سەیری دەکرد.

گوتی:" ئەمە چ جۆر دەستێکە، گەر دەتهەوێت فەلەج بی، ببە، هیچ سوودێکی بۆت نییە."

بەخۆی گوت دەی، سەیری ئاوە تاریکەکە و خواری گوریسەکەی کرد. ماسییەکە بخۆ، دەستت هێزی دەبێت. دەست تاوانی نییە، تۆ ئێستا چەن کاتژمێرە لەگەڵ ئەم ماسییە دێی و دەچی و تێهەڵچوویی، بەڵام تا کۆتایی دونیا ناتوانی لەگەڵی کایەکەی، بیخۆ.

لەتێکی هەڵگرت و خستییە دەمیەوەو هێواش جاوی. تام و چێژێکی خراپی نەبوو.

بەخۆی گوت ماسییەکەی باش بجوو، شیلەکەی دەربێنە، گەر لەگەڵ بڕێک ئاولیمۆ یان خوێ دەتخوارد هێندەش خراپ نەبوو.

دەستە بریندارەکەی وەک جەستەی بوونەوەرێک کە خەریکە گیان دەدات سفتەوە ببوو، پیاو لە دەستی پرسی:" چۆنی دەست؟ تەنیا لەبەر تۆ دیسان دەخۆم."

لەتێکی دیکەی ئەو بڕگەی وا دوو کوتی کردبوو خوارد. ئەوی باش جاوی و پێستەکەی تف کردەوە.

" باشتر بووی، دەست؟ یان ئێستاش زووە، هیچت حاڵی نەبووە؟"

لەتێکی تەواوی هەڵگرت و جاوی. بە خۆی گوت:" لەو ماسییە وزە بەخشانەیە، باش بوو ئەمەم گرت، دۆلفینم نەگرت. گۆشتی دۆلفین شیرینچقە، ئەم ماسییە هیچ شیرین نییە، وزەشی هەیە."

بە خۆی گوت:" دەبێ لەگەڵ ژیان بسازی، ڕێگایەکی دیکە نییە، بریا بڕێکم خوێ دەبوو. نازانم پاش ماوەی ماسییە تۆنەکە لە بەرتاو بۆگەن دەبێت، یان وشکەوە دەبێت. گەر وایە باشترە هەمووی بخۆم، هەرچەن برسیم نییە، ماسی خەریکە هێواش و بەردەوام دەڕوات، هەمووی دەخۆم بۆ ئەوەی ئامادەی کار بم."

گوتی:" خۆڕاگرتر بە، دەست، من ئەم کارە لەبۆ تۆ دەکەم."

بە خۆی گوت بریا دەمتوانی خواردنیش بە ماسییەکە بدەم، ئەم ماسییە برای منە. بەڵام دەبێ بیکوژم، دەبێ هێزی ئەم کارەم هەبێت. ئارام و لەسەرەخۆ تەواوی جنکە گۆشتەکانی خوارد.

هەستایەوەو دەستی بە پانتۆڵەکەیدا هێناو خاوێنی کردەوە.

گوتی:" دەست، ئێستا دەتوانی گوریسەکە بەربدەی. من بە دەستی ڕاست دەیگرم بۆ ئەوەی تۆ لەم یارییە بیتەوە." لاقی

چەپی لەسەر گوریسە ئەستوورەکەی کە بە دەستی چەپیەوە بوو نا، و بە گوشارێک کە گوریسەکە بۆ پشتی دێنە پاڵی داوە.

گوتی:" بریا ئەم سڕی دەستەم تەواو بێت چون نازانم ماسی چ خەیاڵ و پلانێکی لە مێشکدا هەیە."

بەڵام بە خۆی گوت وا دەچێت ماسی هێوەرەو پلانەکەی درێژە دەدا. بەڵام پلانی چییە؟ پلانی من چییە؟ من دەبێ پلانەکەم بە پێی پلانی ئەو دانێم. چونکە ئەم ماسییە زۆر گەورەیە، گەر لە نێو ئاوەکە دەرپەڕێتە دەرەوە دەتوانم بیکوژم، بەڵام بەردەوام لەژێر ئاوە و منیش بەردەوام لەگەڵیم.

دەستی سڕ بووەکەی بە پانتۆڵەکەیدا کێشا و هەوڵی دا قامکەکانی بکاتەوە. بە خۆی گوت ڕەنگە تاو بیکاتەوە. ڕەنگە کاتێک گۆشتە وزە بەخشی ماسییە تۆنەکە چووە خوارەوە بکرێتەوە. گەر پێویست بێت بیکەمەوە، دەیکەمەوە. بە هەر شێوەیەک بێت. بەڵام ئێستا ناتوانم بەزۆری بیکەمەوە، ڕێگا بدە خۆی بیکاتەوە. بە هەوای خۆی بکرێتەوە. دوێشەو کە دەبوو گوریسەکان بکەمەوە و بەیەکەوە گرێ بدەم لەم دەستە داماوە زۆرم کار کێشاوەتەوە.

سەیری پانتایی زەریای کرد و زانی کە چەندە تەنیایە، بەڵام یاری ڕووناکی لە ئاوی قووڵ و تاریک و گوریسە کێشراوەکانی لەپێش چاوی دەدی و شەپۆڵ دانی دەریای مەندی لە مێشکیدا دەکێشایەوە. ئێستا هەورەکان خەریک بوون بۆ کزە بایەک کۆدەبوونەوە و پیاوسەیری پێشەوەی کرد، پۆلێک مراوی کێوی بینی کە لە ئاسماندا دەبینران و ون دەبوون و دیسانەوە

دەردەکەوتن و پیاو زانی کە هیچ کەس لە زەریادا تەنیای تەنیا نەبووە.

لەگەڵ خۆی گوتی، بەشێک لە خەڵک دەترسن کە بە بەلەمێکی چکۆلە لە دیمەنی وشکییەکان دوور کەونەوە. دەیزانی ئەم خەڵکە لە وەرزگەلی گێژەنە ناکاوەکان دەتوانن ئەو بڕیارە بدەن. بەڵام ئێستا وەرزی فەرتەنەیە کاتێک کە تۆفان نەبێت باشترین کەشی ساڵە.

گەر فەرتەنەیەک بیهەوێت هەڵکات، چەن ڕۆژ پێشتر هێماکانی لە ئاسمان دەکرێ ببینرێ. پیرەمێرد بە خۆی گوت کە لە وشکی نابینن، چون نازانن کە دەبێ چی ببینن. لە وشکی ڕەنگە شێوەی هەورەکان جیاوازن. بەڵام ئێستا فەرتەنەیەک لە پێشدا نییە.

سەیری ئاسمانی کرد و هەورە سپی کۆمۆلۆسی بینی کە بەچەشنی تۆپەڵەگەلێکی جوانی بەستەنی کە بەسەریەکدا کەوتبوون. و لەو سەرەوە هێلگەلێکی ناسکی هەوری سیرووس لە ئاسمانی بەرزی پاییز دەبینرا.

گوتی: " بریسای هێوەر، ماسی، ئەم بایە  بۆ من باشترە تا تۆ. "

دەستی چەپی هێشتاش سڕبوو پەنجەکانی نووشتابوونەوە، بەڵام خەریک بوو وردە وردە دەیکردەوە.

بە خۆی گوت ڕقم لە سڕبوونە. سڕ بوون یانی خەیانەت کردن بە جەستەی خۆت. گەر کەسێک بە هۆی خواردنێکەوە دڵی تێک هەڵبێت یان هەڵی بێنێتەوە لای کەسانی دی سووک دەبێت. بەڵام

سڕ بوون کە پیرەمێرد ئەوی بە سپانیایی کالامبەرە ناو نابوو، مرۆڤ لای خۆی تەرێق دەکاتەوە.

لەگەڵ خۆی گوتی گەر کوڕەکە لێرە دەبوو دەستمی لە هەنێشک بۆ خوارەوە دەشێلا و لەم گرژییە  ئارامی دەکردەوە. بەڵام خۆشی هەر نەرم دەبێت.

ئەوکات بە دەستی ڕاستی تێک چوونی کێشانی گوریسەکەی هەست پێ کرد. دواتر دی کە خواری گوریسەکە لە ئاوەکەدا گۆڕاوە. دوایی پاڵی بە گوریسەکە داوە و دەستی بە توندی بە ڕانیدا کێشا و بینی خواری گوریسەکە خەریکە کەم دەبێتەوە.

گوتی:" خەریکە دێتە سەرەوە، دەی دەست، تۆ شەرەفت."

گوریسەکە هێواش‌و لەسەرەخۆ هاتە سەرەوە و ئەوکات ئاوی پێش لە بەلەمەکە بەرزەوە بوو وەک تەپۆڵکەیەک ماسییەکە دەرکەوت. ماسی ماوەیەکی درێژخایەن دەهاتە دەرەوە و ئاو لە هەر دوولایەوە دەڕژا خوارەوە . ڕەنگی لە تاودا دەبرووسکاوە. سەر و ملی ئەرخەوانییەکی تۆخ بوو و هێڵەکانی پشتی لە بەر تاودا دەبووە ڕەنگی بەنەوشێکی کاڵ. نێزەکەی بە قەد دارێکی بیس باڵ درێژی بوو و وەک شمشێرێکی باریکی درێژابوو. و ماسی بە ئێجگاری لە ئاو هاتە دەرەوە دیسان هێواش خۆی خستەوە نێو ئاوەکە، پیرەمێرد تیغەی گەورەی داس شێوەی کلکی دی کە چووە نێو ئاوەکە گوریسەکە دیسان دەستی کرد بە هەڵاتن وەدوای ماسییەکە.

پیرەمێرد گوتی:" باڵای دوو پا لە بەلەمەکە درێژترە." گوریسەکە بە خێرایی خەریک بوو دەڕۆیشت بەڵام خێراییەکەی هاوئاهەنگ بوو. ماسی پەشۆکاو دیار نەبوو. پیرەمێرد هەوڵی دەدا بە دوو دەست گوریسەکە بکێشێت. هەر ئەوەندەی کە نەپچڕێ. دەیزانی گەر نەتوانێ بە گوشارێکی بەردەوام خێرایی ماسییەکە بگرێ، ماسی تەواوی گوریسەکە دەبات و دوایی دەیپچڕێنێت.

بە خۆی گوت ئەم ماسییە، ماسییەکی گەورەیە. دەبێ لە قسەکەمی بگەیەنم، نابێ بێڵم بە هێزی خۆی بچێتە پێش. یان بزانێ کە خۆی ڕزگار کرد، دەزانێ کە چ کار گەلێک لە دژی من بکات. گەر من بەجێگای ئەو بایەم ئێستا تەواوی هێزم بەکار دێنا هێندە دەڕۆیشتم بۆ ئەوەی شتێک بپچڕێ. بەڵام خودا شووکر ئەمانە هێندەی ئێمە کە دەیانکوژین ئەقڵیان نییە. هەرچەن لە ئێمە بە شان و شکۆ و تواناترن.

پیرەمێرد ماسیگەلی گەورەی زۆری دیبوو، زۆری ماسی دیبوو کە پتر لە پێنسەد کیلۆ کێشیان بوو. خۆشی لە ژیانیدا دوودانە لەو ماسییانەی ڕاو کردبوو. بەڵام نە دەستی بەتاڵ. ئێستا دوور لە دیمەنی وشکی تووشی ماسییەک ببوو کە بەو گەورەییە هیچکات نەیدیبوو، گەورەتر لەوەی کە ناوبانگی بیستبوو. دەستی چەپی ئێستاش بە شێوەی چنگی هەڵۆ بەستراو بوو.

بە خۆی گوت، ئاخری دەکرێتەوە، متمانەم هەیە دەکرێتەوە کە هاوکاری دەستی ڕاستم بکات. سێ شت کە بەیەکەوە بران، ئەو ماسییە و ئەم دوو دەستەی من. دەبێ بکرێتەوە، ناقۆڵا بوونی لێ جوان نییە. خێرایی ماسی کەم ببوو و ئێستا بە خێرایی ئاسایی دەڕۆیشت.

پیرەمێرد بە خۆی وت نازانم بۆچی لە ئاو هاتە دەرەوە. دەڵێی دەیویست باڵا و بە خۆیی خۆی پیشان بدات. باشە، دیم. بریا منیش دەمتوانی پیشانی بدەم کە چ جۆر مرۆڤێکم. بەڵام گەر پیشانم دەدا، دەستە گۆجەکەمی دەدی. بێڵە بیرکاتەوە زۆرتر لەمەم. من زۆرتر لەمەم کە هەم، و دەتوانم ببم. بریا من ئەو ماسییە دەبووم لەگەڵ هەر شتێک کە ئەو هەیەتی، لە بەرانبەر ئیرادە و زیرەکی من، تەنیا.

ئاسوودە پاڵی بە دارەکە دابووە ئازارەکان بەو شێوەی کە ڕوویان لە لەشی دەکرد، لە خۆ دەگرت. و ماسی بەردەوام لە نێو ئاوەکەدا دەخزی و بەلەم لە ئاوە تاریکەکە هێواش بەرەو پێش دەچوو. بە بایەک کە ڕۆژهەڵاتەوە دەهات، شەپۆلێکی نزمی دەریای گرتبووەو کاتی نیوەڕۆ دەستی چەپی پیرەمێرد کرابووە.

گوتی:" ماسی هەواڵێکی ناخۆشم بۆت هەیە. "و گوریسەکەی لەسەر تەلیسەکان کە شانیان داپۆشا بوو جێبەجێ کرد.

ئاسوودە بوو بەڵام ئێشی هەبوو. هەرچەن ئازارەکەی پیشان نەدەدا.

گوتی:"  من سەر بە ئایین نیم. بەڵام نەزر دەکەم گەر ئەم ماسییەم گرت دەجار دۆعای ئەی باوکی ئێمە و دەجار دۆعای حەزرەتی مریەم بخوێنم. گەر ئەم ماسییەم گرت بۆ سەردانی مەزاری  مریەمی پاکیزە بڕۆم. بەڵێن دەدەم."

لەپڕتاو دەستی کرد بە دۆعا خوێندن. جار وا هێندە هیلاک بوو کە لەبیری دەچووە. دواتر خێرا خێرا دەیخوێند کە لەبیری

بێتەوە. بە خۆی گوت خوێندنی دۆعای حەزرەتی مریەم ئاسانتر لە دۆعای ئەی باوکی ئێمەیە.

" سڵاو لە مریەمی پیرۆز، خودا لەگەڵت هاودەنگتە. پیرۆزی تۆ لە نێو ژنان. و پیرۆزە عیسا لە ناخی تۆ. ئەی مریەمی پیرۆز دایکی مەسیح ئێمەی تاوانبار دۆعا کە. لەم کاتژمێری مەرگەدا. ئامین." دواتر زیادی کرد. ئەی کچی پیرۆز بۆ مردنی ئەم ماسییەش دۆعاکە هەرچەن کە ماسییەکی بەشکۆیە.

کە دۆعاکەی خوێند حاڵی باشتر بوو. بەڵام ئازارەکەی هەروا مایەوە. ڕەنگە زۆرتریش. ئەوکات بە تەختەی پێش بەلەمەکە پاڵی دایەوەو بێ تاقەت دەستی کرد بە جووڵاندنەوەی قامکی دەستی چەپی.

ئێستا تاو سوور بوو با وردە وردە هاژەی زۆرتر دەبوو.

پیرەمێرد گوتی: بڕۆم ئەو گوریسە چکۆلە لەسەر سنگی بەلەمەکە هەڵگرم و چێشتەیەکی پێوە بکەم. گەر ماسییەکە بیهەوێت شەوێکی دیکە بەردەوام بێت،لەم گەمەی سەرە مەرگەی، دەبێ شتێک بخۆم. ئاوی گۆزەکەم خەریکە تەواو دەبێت. لێرە بڕوا ناکەم شتێک جگە لە دۆلفین دەس کەوێت. بەڵام گەر تازەکەی بخۆم، خراپ نییە. بریا ئەمشەو ماسییەکی باڵندە دەکەوتە بەلەمەکەوە. بەڵام من چرام نییە کە بە بۆنەی چراکەوە بێن بۆ ئێرە. ماسی باڵندە خاوەکەی زۆر بە چێژە. پێدا هاتنیشی ناوێ دەبێ هەرچی هێزم هەیە ڕایگرم. خودا، هیچ نەمدەزانی بەم گەورەییەیە ."

گوتی:" دەیکوژم بەو هەموو گەورەیی و بەشکۆییەوە."

بەخۆی گوت هەڵبەت زوڵمە، بەڵام پیشانی دەدەم مرۆڤ چ کارگەلێک دەتوانێ بکات و تاکەی دەتوانێ خۆبگرێت.

گوتی :" بە کوڕەکەم گوت چ پیرەمێردێکی  نامۆم، ئێستا دەبێت بیسەلمێنم."

هەزار جارێک کە پێشتر سەلماندبووم بەکار نەدەهات، ئێستا خەریک بوو جارێکی دیکە دەیسەلماند، و ئەو لە جەنگەی کار دا هیچکات بیری لە ڕابردوو نەدەکردەوە.

بە خۆی گوت بریا دەخەوت بۆ ئەوەی منیش دەخەوتم. خەوی شێرەکانم دەدی، بۆچی ئیدی تەنیا شێرەکان لە خەوندا دەبینم؟ بەخۆی گوت، بیر مەکەوە پیرەمێرد ئێستا هێمن لەسەر ئەم دارە دانیشە و بیر لە هیچ مەکەوە. ئەو خەریکە هەوڵ دەدات. تۆ هەرچی دەتوانی کەمتر هەوڵ بدە.

نیزیکەکانی نیوەڕۆ بوو، بەلەمەکە هێواش و بەردەوام و بە شێنەیی بەرەو پێش دەڕۆیشت. بەڵام ئێستا بای ڕۆژئاوا لەگەڵ ڕاکێشانی بەلەمەکە زۆری کرد بوو و پیرەمێرد لەگەڵ شەپۆلگەلێکی کەم دەڕۆیشت و ئێشی گوریس، ئارام و کز  بە پشتی دەنیشتەوە.

نیوەڕۆ، جارێکی دیکە گوریس دیسان بڕیاری هاتنە سەرەوەی دا. بەڵام ماسی بە ڕێگاکەی درێژەی دا هەرچەن بڕێک سەرتر. تاو بەسەر باسک و شانەی چەپ و پشتی پیرەمێرد خۆی دەسوو.

دیار بوو کە ماسی ڕێگاکەی لە باکوورەوە بۆ ڕۆژئاوا خوار کردۆتەوە.

ئێستاکە جارێک ماسییەکەی دیتبوو دەیتوانی وێنای بکات کە باڵە چکۆلە ژێرووە ئەرخەوانییەکانی وەک دوو باڵ کردۆتەوە و کلکە گەورە شەکاوەکەی ئاوی تاریک هەڵدەدڕێ. بە خۆی گوت، نازانم لەو قووڵاییە چاوی چەندە دەبینێت چاوەکانی زۆر گەورەن، ئەسپ کە چاوەکانی وردترن لە تاریکی دەبینن سەردەمێک منیش لە تاریکی باشم دەدی. نە لە تاریکییەکی چڕ، هێندەی کە پشیلە دەبینێت.

تاو و بزاڤی بەردەوامی قامکەکان، سڕبوونی دەستی چەپی بە ئێجگاری لا بردبوو، پیرەمێرد وردە وردە گوشارێکی زۆرتری دەخستە سەر دەستی چەپی. و ماسۆڵکەکانی پشتی تەکان دەدا و دەیشێلا بۆ ئەوەی ئێشی گوریسەکە برێک جێبەجێ کات.

بەرز گوتی:" ئەی ماسی گەر تا ئێستا هیلاک نەبووی بزانە زۆر نائاساییت."

ئیدی زۆر هیلاک بوو دەیزانی بەمزووانە دەبێتە شەو، هەوڵی دا بیر لە شتی دیکە بکاتەوە. بە یانە گەورە کان، کە ئەوانی" گران لیگاس" ناو دەناو دەیزانی کە "یانکیەکانی نیۆیۆرک لەگەڵ "پڵنگەکانی دێترۆیت" کێبەرکێیان هەیە.

بە خۆی گوت ئەمە ڕۆژی دووهەمە کە هەواڵی ئاکامی کێبەرکێکانم نییە. بەڵام دەبێ متمانەم هەبێت. و بڕوام بە دی ماجۆی گەورە بێت. کاری بێ نوقسانە. هەرچەن پاشنەی پێی

مێخەکەی ئێسکی دەرکردووەو دێشێ. لە خۆی پرسی مێخەکەی ئێسکی چییە؟ ئێمەی مرۆڤ چۆن شتێکمان نییە،یانی ئازاری وەک ئەوە وایە نینۆکی قولاپەی کەڵەشێری شەڕ کردن لە پاشنەی پێی مرۆڤ تێهەڵچوویێت؟ بیر ناکەم، من توانایم نییە، یان ئەوەیکە چاوێکم یان هەر دووچاوم کوێر بوویێت و وەک کەڵەشێر شەڕ کەم. مرۆڤ لەتەک مریشک و بوونەوەرە گەورەکان هێندەی جیاوازی نییە، بەڵام من دیسان حەز دەکەم بەجێی ئەو بوونەوەرە لە نێو تاریکی زەریادا بم.

بەرز گوتی:" مەگەر سەماسییەکان بۆم بێن، گەر سەماسییەکان بێن، خودا بە هانای من و ئەو بێت."

بە خۆی گوت بیر دەکەیەوە دی ماجۆ هێندە لەسەر ماسییەک ڕاوەستێ کە من ڕاوەستاوم؟ متمانەم هەیە ڕادەوەستێ زۆرتریش ڕادەوەستێ. چونکە ئەو لاو و بەهێزە. جگە لەمەش، باوکی ماسیگر بووە، بەڵام ئەو مێخەکە ئێسقانییە ئازاری نادات؟

بەرز گوتی:" نازانم، من تا ئێستا شتی وام بۆ پێش نەهاتووە."

کاتێک کە تاو نیشتەوە بۆ ئەوەیکە ورەی خۆی بەرز کردبێتەوە، وەبیری هاتەوە کە لە مێخانەیەک لە کازابلانکا لەگەڵ ئەو ڕەش پێستە گەورەی خەڵکی سێن فۆئێگیس کە بەهێزترین پیاوی کەنداو بوو زۆرانی دەستشکاندنەوەیان کردبوو. ڕۆژ و شەوێک هەنیشکەکانی لەسەر هێڵێکی گەچی لەسەر مێزەکە دانابوو، مەچەکەکانیان قیت ڕاوەستا بوو و دەستەکان لەیەک توونە بوون. هەرکام هەوڵی دەدا مەچەکی ئەوی دی بشکێنێت ودەستی بخەوێنێت. گرەوی زۆرتر دەکرا و لە ڕووناکی چرا

نەوتییەکان مرۆڤ گەلێکی زۆر دەهاتنە ژوورەوەو دەڕۆیشتن. ئەو سەیری باسک و سیمای پیاوە ڕەش پێستەکەی دەکرد. دوای هەشت کاتژمێری هەوەڵ هەر چوار کاتژمێر ناوبژیوانەکانیان دەگۆڕدرا بۆ ئەوەی ناوبژیوانەکان بتوانن بخەون. لە ژێر نینۆکەکانی هەرکامیانەوە خوێن دەهاتە دەرەوە، هەر دوو سەیری چاو دەستی یەکیان دەکرد. مەرجبەندەکان دەهاتنە ژوورەکەوە سەیریان دەکرد. دیوارەکان داری بوون و بە شینێکی کاڵ ڕەنگ کرابوون. چراکان سێبەری دوو یاریزانەکەیان لەسەر دیوارەکان خستبوو. سێبەری پیاوە ڕەش پێستەکە زۆر پان بوو بە جووڵانەوەی چراکان بە هاتنی با تەکانی دەخوارد.

تەواوی شەو ڕێژەی مەرجبەندییەکان سەرەو خواری دەکرد. و بە پیاوە ڕەش پێستەکە خواردنەوەیان دەدا و سیگاریان بۆ هەڵدەکرد. ڕەش پێستەکە دوای خواردنی ئارەق هێزی زۆر دەبوو و جارێک دەستی پیرەمێرد، ئەوکات پیر نەبوو ناوی پاڵەوان سانتیاگۆ بوو، چوار قامک خەواندی. بەڵام پیرەمێرد دیسان دەستی ڕاست کردەوە. ئەوکات زانی ڕەش پێست کە پیاوێکی خۆش ناو و یاریزان بوو دەباتەوە. کەش کە خەریک بوو ڕووناک دەبوو مەرجبەندەکان وتیان دەرئەنجامی کێبەرکێکە دەبێت بەرانبەر بێتەوە. ناوبژیوانەکە خەریک بوو سەری تەکان دەدا. کە هێزی خۆی کۆ کرد و دەستی ڕەش پێستەکەی هێنا خوارەوە تا ئەوەیکە لەسەر مێزەکە خەواندی. کێبەرکێ بەیانی یەکشەنبە دەستی پێ کرد و بەیانی دووشەنبە تەواو بوو. زۆرینەی قومارباز‌ەکان دەیانویست دەرئەنجامەکەی هاوشان بێتەوە چونکە دەیانویست بچنە سەرکاری خۆیان لە شرکەتی زوخاڵی هاوانا یان لە بەندەرگە تەلیسە شەکرەکان بار بکەن. دەنا

هەموو دەیانویست کە کێبەرکێکە ئاکامی بێت. بەڵام ئەو کێبەرکێکەی بە ئاکام گەیاند. پێش ئەوەی کە کەسێک بچێتە سەر کاری خۆی.

لەوە بەدوا تا ماوەیەک پاڵەوان بانگیان دەکرد. هەر لەوێ بۆ بەهاری دی کێبەرکێکەی دووبارە کردەوە. بەڵام پارەیەکی زۆر دانەنرا و کەسی کەم خۆی لێدا. ئەو بە ساکاری بردییەوە. چون کە لە کێبەرکێی هەوەڵدا ورەو بڕوا بە خۆیی پیاوە ڕەش پێستەکەی خەڵکی سین فوئگۆسی لە ناوبردبوو. دوای ئەو لە چەن کێبەرکێی دیکە بەشداری کرد و ئیدی پاشەکشەی کرد. بەم ئاکامە گەیشت کە بەڕاستی هەرکەسی بیهەوێت دەتوانێ بیباتەوە بەم ئاکامە گەیشت کە ئەم کارە بۆ دەستی ڕاستی و ماسیگری زیانی هەیە،. چەن کێبەرکێی لەگەڵ دەستی چەپی کرد بەڵام دەستی چەپی هەمووکات دەکەوتە دواوە و ئەو کارەی ئەم دەیویست نەیدەتوانی جێبەجێی کات و بڕوای بەو دەستەی نەبوو.

بە خۆی گوت ئێستا تاو بە باشی گەرمی دەکات. ئیدی ناخەوێت. مەگەر ئەوەی شەو زۆر سارد بێت. نازانم ئەمشەو چیم لە پێشە.

فڕۆکەیەک بەرەو مەیامەی لە ئاسمانی سەریەوە تێپەڕ بوو پیرەمێرد بینی کە سێبەری فڕۆکەکە بڵاوەی بە پۆلی ماسییە باڵندەکانی کرد.

گوتی:" لە نێو ئەم هەمووە ماسییە باڵندە، دۆلفینیش دەبێ ببێت." پاڵی بە گوریسەکە داوە بۆ ئەوەی بزانێت دەتوانێ خۆی بە ماسییەکە نیزیک کات یان نا. بەڵام نەیتوانی و گوریسەکە هێندە توونەد بوو ئاوی لێ چۆڕایەوە کە هێندەی نەمابوو بپچڕێ.

بەلەمەکە هێواش دەچووە پێش ئەو هێندەی سەیری فڕۆکەکە کرد تا ئەوەیکە لە نێو چاوانی ون بوو.

بە خۆی گوت دانیشتن لە نێو فڕۆکە دەبێ زۆر سەیر و سەمەر بێت. نازانم زەریا لەو سەرەوە بە چ شێوەیەکە. گەر زۆر لە بەرزایی دا نەفڕن دەتوانن ماسییەکان ببینن. حەزم دەکرد هێواش لە دووسەد باڵا بەرزایی بفڕم و ماسییەکە لەوێوە ببینم. لە بەلەمی ڕاوە کیسەڵ من لە جێ ڕوانینی کۆڵەکەکان دادەنیشتم و تەنانەت لەو بەرزاییەوە زۆر شتم دەبینی. دۆلفینەکان لەوێ سەوزتر دەهاتنە بەرچاو هێڵ و خاڵە ئەرخەوانییەکانیان دیار بوو، و هەموو پۆلەکان کە مەلە دەکەن دەبینرێ، بۆچی تەواوی ماسییە خێراڕۆکان پشتیان ئەرخەوانییە و یان ئەوەیکە خاڵ و هێڵی ئەرخەوانییان هەیە؟ هەڵبەت دۆلفین سەوز دەردەکەوێت چون زێڕین ڕەنگە. بەڵام کاتێک کە زۆر برسییە و بۆ خواردن دێت لەسەر لاچەنگەکانی وەک مارڵین هێڵگەلی ئەرخەوانی دەردەکەوێت. ئایا لە تووڕەییە یان خێرایی زۆر کە ئەم هێڵانە دەردەکەون؟

پێش لە تاریکی لە پەنای دورگەیەکی گەورە لە گیای ساراگۆسا تێپەڕبوون کە بە شەپۆلێکی کورت سەرەو بن دەبوون. بەچەشنی ئەوەیکە زەریا لە ژێر لێفەیەکی سەوزباو خەریکە دەس لە ملانێ دەکات. دۆلفینێک گازی لە گوریسە چکۆلەی پیرەمێرد گرت. پیرەمێرد هەوەڵ دۆلفینەکەی دی کە بازیدا و لە کۆتا ڕووناکی تاو، شێوەی زێڕینی کەوتە بەرچاو. نووشتابووە و باڵە چکۆلەکانی دەجووڵاندەوە. دۆلفین لە ترسانا هەڵدەبەزاو و سەرمو قولانجی دەدا، پیرەمێرد خۆی بە پشتەوەی بەلەمەکە گەیاند و نووشتایەوە

و گوریسە گەورەکەی بە باسک و دەستی ڕاستی گرت و بە دەستی چەپی دۆلفینەکەی هەڵکێشا سەرەوە . هەر جار لاقی چەپە ڕووتەکەی لەسەر گوریسە هەڵکێشاوەکە دادەنا. کاتێک کە ماسییەکە کەوتە پشتەوەی بەلەمەکە و بەهەوڵێکی زۆر خۆی بە تەختەکەدا دەدا. خەریکی گیان دان بوو، پیرەمێرد بەسەر پشتەوەی بەلەمەکە نووشتایەوە و ماسی زێڕین بە خاڵگەلی ئەرخەوانییەوە لەسەر تەختەکە هەڵگرت و خستییە سەر تەختی بەلەمەکە. کەڵپەکانی خێرا و بەردەوام گازی لە قولاپەکە دەگرت و بە جەستەی درێژ و پانی بە کلک و سەری بە تەختی بەلەمەکەدا دەکوتا، تا ئەوەیکە پیرەمێرد بەتێڵا هێندەی بە تەپڵە سەرە زێڕینەکەیا کێشا کە دۆلفین لەرزاو لە جووڵە کەوت.

پیرەمێرد قولاپەکەی لە دەمی دەرهێنا سەردینێکی دیکەی پێوە کرد و خستییەوە زەریا. دواتر هێواش هێواش خۆی بە پێشەوەی بەلەمەکە گەیاند دەستی چەپی شۆرد و بە پانتۆڵەکەی وشکی کردەوە. دوایی گوریسە قورسەکەی لە دەستی ڕاستی دای بە دەستی چەپی و دەستی ڕاستی لە زەریادا شۆرد. لە خۆر کە خەریک بوو دەچووە زەریاوە و لە خواری گوریسەکە چاوی بڕیبوو.

گوتی:" هیچ گۆڕانێکی تێدا پێش نەهاتووە" بەڵام گەڕانی ئاوی بەسەر دەستیا دی و زانی هێواشترە و هێوەرتر بووە.

گوتی سەوڵەکان لەسەر تەختەکە دەبەستمەوە. ئەم کارە خێرایی لە شەودا دەگرێ. ماسی ئەمشەو زیندووە، منیش زیندووم.

بە خۆی گوت نابێ لە هەڵدڕینی زگی ماسییەکە پەلە کەم، کە خوێنەکەی بە فیرۆ نەچێت. کاتژمێرێکی دیکە ئەم کارە دەکەم هەر ئەوکات سەوڵەکان دەبەستمەوە کە خێرایی بەلەمەکە بگرێت. ئێستا باشترە ماسییەکە هێوەر ڕاگرم و لەم خۆرنشینەدا زۆر سەروە سەری نەخەم. ڕۆژئاوا بوون بۆ ماسییەکان کاتێکی دژوارە.

دەستی لەبەر با ڕاگرت بۆ ئەوەی وشکەوە بێت و دواتر هەر بەو دەستە گوریسەکەی گرت تا ئەو شوێنە کە دەیتوانی خۆی شل کرد و ڕێگای دا کەلەسەر دارەکە بکێشرێتەوە بەشێوەیەک کە بە بەلەمەکە بەقەد خۆی یان زیادتر گوشار بێت.

بەخۆی گوت خەریکم ڕێگاکەی فێر دەبم، یان ڕێگای ئەم بەشەی. لەبیرت بێ لەو کاتەوە چێشتەکەی گرتووە هیچی نەخواردووە جەستەی زۆر گەورەیە و پێویستی بە خواردنی زۆرە. من هەموو ماسییە تۆنەکانم خوارد. سبەینێ دۆلفینەکە دەخۆم. دۆلفینەکە ی " دورادۆ " زێڕین ناوناوە. ڕەنگە کاتێک خاوێنم کرد پێستەکەیم داماڵی بەشێکی بخۆم. خواردنی لە ماسی تۆن ناخۆشترە بەڵام هیچ کارێک ئاسان نییە.

بەرز پرسی:" ماسی حاڵت چۆنە؟ من کە باشم، دەستی چەپم باشترە خواردنی شەوڕۆژێکم هەیە، ئێستا ڕایکێشە بەلەمەکە."

حاڵی بەڕاستی باش نەبوو چونکە ئێشی گوریسەکە بە پشتییەوە لە ئێش تێپەڕ ببوو و گەیشتبووە ئاستی برینێک کە جاڕزی دەکرد. بەڵام بیری کردەوە من خراپتر لەمانەشم دیوە دەستم تەنیا بڕێک

براوە سڕ بوونی دەستەکەی دیکەشم ڕۆیشتووە لاقەکانم کێشەیان نییە لە خواردنیش لە پێشی ئەوم.

ئێستا ئاسمان تەمێکی ڕەشی پێدا کێشرابوو چونکە لە پاییزدا دوای کەوتنی تاو هەوا زوو تاریک دەبێت. لەسەر تەختە ڕووشاوەکەی پێشەوەی بەلەمەکە خەوتبوو. هەرچی دەیتوانی پشووی دەدا. هەوەڵ ئەستێرەکان دەرکەوتبوون، ناوی ڕجل و الجباری نەدەزانی بەڵام ئەوی دی و زانی کە بەزوویی تەواوی ئەستێرەکان دەردەکەون و تەواوی هاوڕێ دوورەکانی لەگەڵی دەبن و چاوی لێ دەترووکێنن.

بەرز گوتی:" ماسییەکەش هاوڕێی منە، تا ئێستا ماسیی وام نەدیوە ناوبانگیم بیستووە بەڵام دەبێ بیکوژم هەر باشە پێویست نییە ئەستێرەکان بکوژم."

بەخۆی گوت گەر مرۆڤ ناچار بێت مانگ بکوژێ چی دەبێت، مانگ هەڵدێت بەڵام گەر مرۆڤ ناچار ببوایە خۆر بکوژێ چی، بەخۆی گوت زۆر باشە کە بەم شێوە نییە.

ئەوکات دڵی بۆ ئەو ماسییە سووتا وبەزەیی پێیدا هات کە هیچی نەخواردووە و داخێک کە بۆ ئەو بووی لە بڕیاری بۆ کوشتنی ئەو کەمترین کێشەی ساز نەکرد، لە خۆی پرسی ئەم ماسییە دەبێتە خواردنی چەن کەس؟ ئایا مرۆڤەکان لایەقی خواردنی هەن؟ نە هیچکات نییانە. ئەوشێوەی کە لە هەڵسوکەوت و ئاکاری دیارە هیچ کەس لایەقی خواردنی نییە.

بە خۆی گوت من لەم شتانە سەر دەرناهێنم بەڵام باشە کە پێویست نییە مانگ و خۆر و ئەستێرە بکوژین. هەر ئەوەندەی تەواوە خواردنەکانمان لە زەریا بگرین و براکانی خۆمان بکوژین.

بەخۆی گوت دەبێ ئێستا بیرێک بۆ بەستنەوەی سەوڵەکان بکەم. مەترسی لەگەڵە، سوودیکیشی هەیە. گەر ماسییەکە دەست بەهەوڵ دان بکات من سەوڵەکام بۆ کەم کردنەوەی خێراییە بەستبێتمەوە و بەلەمەکە سووکییەکەی بە تەواوەتی لێ ڕۆیی بێت، ئەگەری هەیە هێندە گوریس بەفیڕۆ بدەم لە ئیدی نەتوانم بیگرم. بەلەم کە سووک بێت دەبێ هەردوو لایەن ئەرکێکی زۆرتر بکێشن، درێژتر دەبێت، بەڵام بۆ من متمانەی زۆرترە چون کە ئەم ماسییە خێرایی زۆرەو کە ئێستا پیشانی نەداوە. هەرچی دەبێت بابێت،، دەبێت زگی دۆلفینەکە هەڵبدڕم تا ئەوەیکە خراپ نەبووە، کەمێ لە گۆشتەکەی بخۆم با وزەم بچێتە سەرەوە.

کاتژمێرێکی دیکە پشوو دەدەم و گەر بینیم کە ئەرخەیان و بەردەوام دەڕوات دەچمە پشتەوەی بەلەمەکە بڕیاری خۆم دەدەم.

هەروەها دەبینم کە ئەو چی دەکات، ڕەنگە هەڵس و کەوتی بگۆڕی. بەستنەوەی سەوڵەکان بیرێکی چاکە بەڵام ئێستا کاتێکە کە دەبێت ئاگادارتر بم. ئەم ماسییە ئێستاش هێزی زۆری هەیە، من دیم کە قولاپەکە بە لالێویەوەتی و ئەو دەمی بەتەواوی بەستراوە. ئێشی قولاپ شتێک نییە. ئازاری برسێتی و ئێشی ئەوەیکە لەگەڵ شتێک ڕووبەڕوو دەبێتەوە کە نازانێ چییە لەسەرەوەی هەموویەتی. ئێستا پشوو بدە، پیرەمێرد ڕێگا بدە ئەو کاری خۆی بکات تا کاتی کاری دیکەت دەگات.

ماوەیەک کە پێدەچوو دوو کاتژمێرێک بێت پشووی دا. مانگ تا کاتێکی درەنگ دەرنەکەوت، ئەو ڕێگایەکی بۆ تێگەیشتن لە کات نەبوو. هیلاکییەکەی بە تەواوەتی دەرنەدەچوو، تەنیا تۆیەک لە هەزار تۆی لادەچوو. گوشاری قورسی ماسی هەروەها لەسەر شانەکانی بوو. بەڵام دەستی چەپی لەسەر لێواری بەلەمەکە دانا و گوشاری ماسییەکەی وردە وردە خستە سەر بەلەمەکە.

گوتی گەر دەمتوانی گوریسەکە ببەستمەوە چەندە کارم ئاسانتر دەبوو. بەڵام ماسی بەتەکانێک گوریسەکە دەپچڕێ. دەبێت جەستەم بۆ ڕاکێشانی گوریسەکە بکەمە کۆڵەکەی بۆ ئەوەی بەردەوام ئامادە بم کە بە هەر دوو دەست گوریسەکە شل کەم.

بەرز گوتی:" بەڵام پیرەمێرد، تۆ ئێستاش نەخەوتوویی، شەوێک و نیوە ڕۆژێک و ئێستاش ڕۆژێکی دیکە کە نەخەوتوویی. دەبێت کارێک بکەی کاتێک ماسییەکە هێوەر بوو بڕێک بخەوی، گەر نەخەوی مێشکت لەکار دەکەوێ."

بەخۆی گوت مێشکم گەشاوەیە. زۆریش، بە ڕووناکی ئەم ئەستێرانە کە برای منن. بەڵام دەبێ بخەوم. ئەستێرەکانیش دەخەون. مانگ و خۆریش دەخەون. تەنانەت زەریاش چەنێک لە ڕۆژەکان دەخەوێ ڕۆژگەلێک کە تەوژمێک نییە و ئاو مەندە.

بەخۆی گوت بەڵام لەبیرت بێ کە بخەوی. خۆت ناچار بکە بخەوی. بۆ گوریسەکەش چارەیەک بدۆزەوە. ئێستا بڕۆ ئەو سەر، دۆلفینەکە حازر بکە. گەر بتهەوێ بخەوی بەستنەوەی سەوڵەکان کارێکی مەترسی دارە.

بە خۆی گوت بێ خەویش دەتوانم سەرکەم. بەڵام مەترسییەکی زۆری بەدواوەیە.

بە گاوڵکێ بەرەو پشتەوەی بەڵەمەکە ڕۆیشت. ئاگادار بوو کە ماسییەکە نەجووڵێنێتەوە. بە خۆی گوت ڕەنگە ماسییەکەش نیوە خەو بێت. بەڵام من نامهەوێت کە پشوو بدات و بحەسێتەوە دەبێت ئەو گوریسە هێندە بکێشم کە بمرێت.

کە گەیشتە دواوەی بەلەمەکە، سووڕا، بە شێوەیەک کە دەستی چەپی گوشاری گوریسەکەی گرتبوو، و چەقۆکەی بە دەستی ڕاست دەرهێنا. ئێستا ئەستێرەکان دەدرۆشانەوە ئەو دۆلفینەکەی بە جوانی دەدی.  تیژی چەقۆکەی لە دۆلفینەکە ڕۆ کرد. ئەوی لە ژێر تەختەکە دەر هێنا. یکێک لە لاقەکانی لەسەر ماسییەکە دانا، بە خێرایی لە خوارەوە تا لمۆزی هەڵیدڕی. ئەوکات چەقۆکەی داناو بە دەستی ڕاستی ناوزگی دۆلفینەکەی دەرهێنا. و سییەکانی دەرهێنا. گەدەی ماسییەکە خلیسک و قورس لە نێو دەستیدا بوو لێی ڕانەوەستا ئەویشی هەڵ دڕی. دوو ماسی باڵندەی لە نێودا بوو. ماسییەکان تازەو سفت بوون و پیرەمێرد ئەوانی لە تەنیشت یەکتری ڕاکشاند و ڕیخۆڵەو و سییەکانی فڕێدا نێو زەریا. کە نوقم بوون هێڵێکی ڕووناکیان لە نێو ئاو درووست کرد. جەستەی دۆلفینەکە سارد بوو ئێستا لە ژێر ڕووناکی ئەستێرەکان سپییەکی ڕووناکی پەڵەدار دەینواند. پیرەمێرد لاقی ڕاستی لە سەر ماسییەکە دانا و پێستی لایەکی لێ کردەوە. دواتر وەری گەڕاند پێستی لاکەی دیکەی لێکردەوە و گۆشتی هەر دوو لاکەی لە کلکەییەوە تا سەری لێ کردەوە. و بەتەواوی کەوڵی داماڵی.

کەلاکەکەی فڕێ دا نێو ئاوەکەوە، نیگای لەگەڵی برد بۆ ئەوەی جووڵانەوەیەک لە ئاودا ببینێت. بەڵام تەنیا ڕووناکی ڕۆچوونی هێواشی کەلاکەکەی دەدی. دواتر گەڕاوە ئەو دوو ماسییە باڵندەکەی لە نێوان ئەو دوو لەتە گۆشتە ماسییە داناو چەقۆکەی لا برد. بەرەو پێشەوەی بەلەمەکە ڕۆیشت. پشتی لە قورسایی گوریسەکە نووشتابووە و گۆشتی ماسییەکەی لە دەستی ڕاستی دا بوو.

کە گەیشتە پێشەوەی بەلەمەکە دوو لەتە ماسییەکەی لەسەر تەختەکە داناو ماسییە باڵندەکانی لە تەنیشتیانەوە جێ کردەوە. دواتر گوریسەکەی لەسەر شانی جێ بەجێ کرد. دیسان پاڵی بە قەراغی بەلەمەکە داوە و گوریسەکەی بە دەستی چەپی گرت. دواتر نووشتایەوە و ماسییە باڵندەکانی لە نێو ئاو شۆردەوە. خێرایی تەوژمی ئاوەکەی لەسەر پشتی دەستی پێوا. دەستی لە لێکردنەوەی پێستی ماسییەکە دەدرەوشایەوە ئەو تەوژمی ئاوەکەی بەسەر دەستیەوە بینی. تەوژمەکە ئاوەکە بڕێک نیشتبووە. کاتێک دەستی بە بەلەمەکەدا دەهێنا و دەیشۆرد پەڵە درەوشانەوەکان لێ دەبوونەوە و هێواش لەگەڵ ئاوەکە دەڕۆیشتن.

پیرەمێرد گوتی:" یان هیلاک بووە یان خەریکە پشوو دەدات. ئێستا ئەم دۆلفینە بخۆم، دواتر بڕێک بخەوم و بحەسێمەوە."

لە ژێر ترووسکەی ئەستێرەکان، کەش خەریک بوو بەرەو ساردی دەڕۆیشت و پیرەمێرد نیوەیەک لە لەتە گۆشتەکان و یەکێک لە ماسییە باڵندەکان کە خاوێنی کردبووە، خوارد.

گوتی:" دۆلفین کولاوەی  چەن بەتام و چێژە، بەڵام کاڵی چەندە ناخۆشە. ئیدی بێ خوێ و ئاوی لیمۆ نایەمە زەریاوە."

 بە خۆی گوت گەر ئاقڵ بایەم ڕۆژانە ئاوم دەکرد بەسەر تەختەکەدا وشک کە دەبووە خوێم دەبوو. بەڵام ئەم دۆلفینەم لای ئێوارە گرتووە. لەگەڵ ئەوەی کارەکەم پلانی نەبوو، بەڵام هەموویم چاک جاوی، دڵم تێک هەڵنەهات.

هەور ئاسمانی لای ڕۆژهەڵاتی تەنیبووەو ئەو ئەستێرانەی وا پیرەمێرد دەیانی ناسی خەریک بوون لە نێویدا ون دەبوون. ئێستا بە چەشنی ئەوەی بوو کە خەریکە دەچێتە دۆڵێک لە هەورەوە و با کز نیشتبووە.

گوتی:" سێ چوار ڕۆژی دیکە کەش دەگۆڕدرێ بەڵام ئەمشەو نا سبەینێش نا، پیرەمێرد ئێستا پاڵ بدەوە کە ماسییەکە بە شێنەیی دەڕوات و تۆش سەر خەوێک بشکێنە."

گوریسەکەی تووند بە دەستی ڕاستییەوە گرت و دواتر ڕانی لە ژێر دەستی ڕاستی دانا و تەواوی کێشی لەسەر داری پێشەوەی بەلەمەکە دانا. دواتر گوریسەکەی کەمێک شل کردەوە و دەستی چەپی لە پشتەوەی قولاپ کرد.

بە خۆی گوت تا کاتێک کە بەم شێوەیە قولاپ بوو بێت دەستی ڕاستم دەتوانێ ڕایگرێت. گەر دەستی ڕاستم لە خەودا شل بوو گوریسەکە هەڵات دەستی چەپم وەخەبەرم دێنێتەوە. گوشارێکی زۆر لەسەر دەستی ڕاستمە. بەڵام ئەو لەگەڵ ئازار خووی گرتووە. گەر بیست خولەک یان نیو کاتژمێر بخەوم هەر باشە.

بۆ پێشەوە نووشتاوە. تەواوی جەستەی خستە ژێر گوشاری گوریسەکە تەواوی کێشی خستە سەردەستی ڕاستی و چووە خەو.

خەوی شێرەکانی نەدی. خەوی پۆلێکی گەورەی دۆلفینی دی کە فەرسەنگێک یان زۆرتر درێژایی بوو. کاتی جووت بوونیان بوو و هەڵدەبەزینەوە دیسان ڕوویان دەکردە هەر ئەو بازنەی وا سازیان کردبوو.

دواتر خەونی بینی کە لە دێهاتەکەیان و لە شوێنی خەوەکەی خەوتووە و شەماڵ دێت و سەرمایەک لە گیانی دەئاڵێ و دەستی ڕاستی سڕ بووە. چون بە جێگای سەرین دەستی لە ژێر سەری داناوە.

دوای ئەو خەونی کەنارە زەرباوەکانی دی. هەوەڵ شێرەکانی دی کە لە تاریکی هەوەڵ خۆرنشین دێنە کەنار و دواتر شێرەکانی دیکە دێن. ئەو چەناگەی لەسەر تەختەکەی پێشەوە داناوە و کەشتی پاڵی دابووە و کزەیەکی شەوانە بەسەر زەریادا دەهات ،ئەو چاوەڕوانە کە شێرەکانی دیکە بێن و شاگەشە بێتەوە.

مانگ خۆی کێشابووە سەرەوە. بەڵام پیرەمێرد خەوتبوو و ماسی هێواش بەلەمەکەی ڕادەکێشا بەلەم لە دۆڵێک لە هەورەکانەوە دەچوو.

بە ئازارێک کە لە گڕی کێشانی گوریسەکە لە نێو لپیەوەو هەروەها مستێکی ناکاوی دەستی ڕاستی لە نێو دەم و چاوی وەخەبەر هاتەوە. هەواڵی لە دەستی چەپی نەبوو، بەڵام تا توانی بە دەستی ڕاستی خێراییی گوریسەکەی گرت و گوریس هەر

دەچوو. لە کۆتایی دەستی چەپی گوریسەکەی دۆزییەوە و پیرەمێرد پشتی بە گوشاری گوریسەکەوە دا. ئێستا گوریس پشت و دەستی چەپی دەکزاندەوە و دەستی چەپی تەواوی هێز و گوشارەکەی دەگرت و لەگەڵ ئەویش دەڕووشاو بەرەو هەڵدڕان دەچوو. بە ئاڵقە گوریسەکانی پشت سەری چاوێکی خشاند کە هێواش گوریسەکەیان بە دەم ئاو دەدا. لەو ساتەدا ماسی بازێکی داو کێوێکی لە زەریادا هەڵدڕی و دیسان بە کەوتنێکی قورس لەودا ڕۆچووە. دیسان بازی داو دیسان دەیداو بەلەمەکە خێرا دەڕۆیشت و گوریسەکە هەروا هەڵدەهات. پیرەمێرد ڕاکێشانی گوریسەکەی تا ئاستی پچڕاندن گەیاندبوو. بەڵام هەر بەردەوام بوو لە ڕاکێشانی. گوریسەکە ئەوی لەسەر تەختەکە خەواندبوو دەموو چاوی لە نێو لەتە گۆشتی دۆلفینەکە بوو نەیدەتوانی بجووڵێت.

بە خۆی گوت هەر ئەمەیە وا چاوەڕوانی بووم، دەبێت لەخۆ بردووتر بم.

بەخۆی گوت تاوانی گوریسەکەی لێ بکەوە.

بازەکانی ماسی نەدەدی، تەنیا هەڵدڕینی زەریای دەبیست و دەنگی قورسی پرژینی ئاو کاتی تێکەوتنی ماسییەکە. خێرایی گوریسەکە خەریک بوو دەستی دەبڕی، بەڵام هەمووکات دەیزانی کە ئەمە پێش دێت و هەوڵ دەدات کە بڕاوییەکە لەسەر کۆنە برینەکانی دەستی ڕاگرێت و نەهێڵێت گوریسەکە لە نێو دەستی هەڵ بخلیسکیت و قامکەکانی ببڕێت.

گوتی گەر کوڕەکە لێرە دەبوو دەیتوانی ئاڵقە گوریسەکان تەڕ بکات. بەڵێ گەر کوڕەکە لێرە دەبوو گەر، کوڕەکە لێرە دەبوو.

گوریس ڕۆیشت و ڕۆیشت بەڵام ئێستا خەریک بوو سووکتر دەڕۆیشت و پیرەمێرد بە زۆری گوریسی بە ماسییەکە دەدا. ئێستا سەری لە سەر تەختەو لە ناو گۆشتی ماسییەکە کە لە ژێر ڕوومەتی پان و فلێچ ببوو دەرهێنا. ئەوکات ئەژنۆی داداو دواتر هێواش ڕاوەستا. هێشتاش گوریسی دەدا بەڵام هێواشتر. چووە دواوە هێندە چوو کە ئاڵقەکانی لە ژێر لاقی هەست پێ کرد. ئێستاش گوریسی زۆری بوو و ئێستا ماسی دەبێت قورسی تەواوی ئەم گوریسە نوییانە بە دوای خۆی لە نێو ئاو ڕاکێشێت.

بەخۆی گوت ئێستا پتر لە دەجار هەڵبەزیوەتەوەو کیسەکانی پشتی پڕ لە هەوا بوون. ئێستا ناتوانێ خۆی بۆ ژێر ئاو بکێشێت و بمرێت. کە من نەتوانم هەڵیکێشمە سەرەوە. بە زوویی دەست دەکات بە سووڕانەوە ئەوکات دەبێت من کاری لەگەڵ کەم، نازانم چی بوو کە لە ناکاو خستییە جووڵەوە. ئایا برسێتی وای لێ کرد یان لە نێو تاریکی شەودا شتێک ترساندی؟ ڕەنگە لە ناکاو ترساوە. بەڵام زۆر ماسییەکی هێوەر و بەهێز بوو. دەڵێی لە هیچ نەدەترسا، بڕوای بوو. شتێکی نائاساییە.

گوتی:" پیرەمێرد باشترە بۆخۆشت نەترسی. متمانەت بێ، دیسان ڕاتگرتووە، بەڵام ناتوانی گوریسەکەی لێ وەرگرییەوە، لەوانەیە بڕیار بە سووڕانەوە بدات."

پیرەمێرد ئێستا بە دەستی چەپ و شانەکانی ڕایگرتبوو. نووشتایەوەو بەدەستی ڕاست، نێو لپێکی ئاو هەڵگرت. گە گۆشتە

فلیقاوەکەی دۆلفینەکە خاوێن کاتەوە. دەترسا دڵی تێک هەڵ چێت و بڕشێتەوە و هێزی کەم بێت. دەم و چاوی کە خاوێن بووە دەستی لە نێو ئاوەکە شۆردەوە و لە ئاوە سوێرەکە ڕایگرت و هەڵاتنی هەوەڵ تیشکی ڕووناکی پێش تاوی شەفەق نیشانی سەیر کرد. بەخۆی گوت خەریکە بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات، یانی هیلاکە. تەوژمەکە خەریکە دەیبات، بەزوویی دەبێ بسوورێتەوە. ئەوکاتە کە کاری ئێمە بەڕاستی دەست پێ دەکات.

پاش ئەوەیکە هەستی کرد دەستی بە باشی لە ئاوەکەدا بووە دەری هێناو چاوی لێ کرد.

گوتی:" هێندەش خراپ نییە، ئێش بۆ پیاو کێشە نانێتەوە."

بە وردی گوریسەکەی گرت، بەشێوەیەک لە هیچکام لە بڕاوەکان نەکەوێت، کێشی خۆشی جێبەجێ کرد، بە شێوەیەک کە دەستی چەپی خۆی لە نێو ئاو ئەو پەڕی بەلەمەکە بخات.

ڕووی دەمی لە دەستە چەپەکەی کرد و گوتی:"  تۆ دەستێکی نکرکاری، بەڵام خراپیش کارت نەکردووە، بەڵام کاتێک بوو کە هیچ هەواڵێکت لێ نەبوو."

بە خۆی گوت بۆچی بە دوو دەستی کاری گورج و گۆڵەوە بە دونیا نەهاتووم؟ ڕەنگە تاوانبار خۆمم کە ئەمەیانم باش پەروەردە نەکردووە. هەرچەن خودا بۆخۆی دەزانێت مەودای فێر بوونی زۆری بوو، بەڵام شەو کاری هێندەش خراپ نەبوو، تەنیا جارێک سڕ بوو، گەر جارێکی دیکە سڕ بوو دەیدەم گوریسەکە بیپچڕێنێت.

کاتێک کە بەم شێوەیە بیری کردەیەوە زانی مێشکی ڕووناک نییە و بە خۆی گوت کە دەبێت بڕێکی دیکە لە گۆشتی دۆلفینەکە بخوات. دیسان بە خۆی گوت کە ناتوانم. بیرت لە کاردا بێ باشتر لەوەیە کە بڕشێیەوەو بێ هێز ببی، دەزانم گەر بیخۆم لە نێو زگم ڕاناوەستێت، چونکە دەم و چاوم پێدا هێناوە. بۆ ئاگاداری ڕایدەگرم تا کاتێک کە خراپ دەبێت. بەڵام ئێستا کار لە هێز گرتن بە خواردن تێپەڕیوە. بە خۆی گوت چەن گێژی ئەو ماسییە باڵندەی دیکە بخۆ.

ماسی شۆردراوەو حازر بوو. پیرەمێرد بە دەستی چەپی هەڵی گرت و خواردی. بە وردی دڕوەکانی جاوی و هەمووی لە کلکەوە تا سەرەوەی قووت دا.

بە خۆی گوت ئەم زۆرتر لە ماسییەکانی دیکە هێز و وزەی هەیە. هیچ نەبێ ئەوەندەی کە من پێویستمە تێدایە. گوتی تا ئێستا ئەوەی توانیومە کردوومە. بێڵە با بسووڕێتەوە ڕێگا بدە شەڕ بکەین.

لەو کاتەوەی کە هاتبووە زەریا خۆر بۆ جاری سێهەمی بوو کە دەهاتەوە سەرەوە کە ماسی دەیویست بسووڕێتەوە.

پیرەمێرد بە پێی خواری گوریسەکە نەدەبینی کە ماسییەکە دەسووڕێتەوە. ئێستا مابوو کە ببینێت. تەنیا هەستی کرد کە گوشاری گوریسەکە شل بۆتەوەو بە دەستی ڕاست دەستی کرد بە کێشان. گوریسەکە وەک هەمووکات سفتەوە بوو. بەڵام ڕاست لەو ساتەی دا کە بە ئاستی پچڕان گەیشتبوو، خۆی شل کرد و هات . پیرەمێرد سەر و شانەی لە ژێر گوریسەکە دەرهێناو

هێواش و بەشێنەی دەستی کرد بە کێشان. هەر دوو دەستی لەنگەر دەداو دەیکێشا و هەوڵی دەدا کە کاری کێشانەکە بە جەستەی و لاقەکانی جێ بەجێ کات. لاقەکانی و شانەکانی بە لەنگەری دەستەکانی ئەمبار و ئەو بار دەبوو.

گوتی:" ئەو بازانەی وا سازی کردووە زۆر گەورەیە ، بەڵام خەریکە دەسووڕێتەوە."

ئەوکات ئاگادار بووە کە گوریس کە ئیدی نایات، ڕای گرت تا ئەوەی کە بینی دڵۆپەکانی ئاو لە بەر تیشکی تاو لێی دەچۆڕا. دواتر گوریس هاتە دەرەوە. پیرەمێرد ئەژنۆی دادا و هەروا دەیداوە بە ئاوە تاریکەکە.

گوتی:" ئەو لە بازنە سازکراوی نێو ئاوەکە دەسووڕێتەوە دەبێ تا دەتوانم ڕایگرم. گوشاری گوریسەکە هەر جار بازنەکە چکۆلەتر دەکاتەوە. ڕەنگە کاتژمێرێکی دیکە بینیم. ئێستا دەبێت قسەکەمی تێگەیەنم، دواتر دەیکوژم."

بەڵام ماسی ئێستا هێواشتر دەسووڕێتەوە. دوو کاتژمێری خایاند و ئارەق بە جەستەی پیرەمێرد دەهاتە  خوارەوە. بە تەواوی شەکەتی کردبوو. بەڵام بازنەکان ئێستا زۆر چکۆلە ببوونەوە بە پێی خواری گوریسەکان دەیزانی کە ماسی بەردەوام مەلە دەکات و دێتە سەرترەوە.

کاتژمێرێک دەبوو کە پیرەمێرد لە پێش چاوی پەڵەگەلی ڕەشی دەبینی و ئارەق کزەی لە چاوەکانی هەڵدەستاند و برینی سەرەوەی چاوەکانی و ناوچاوانی دەکزاندەوە. لە پەڵە ڕەشەکان

نەدەترسا بەو گوشارەی کە بۆ گوریسەکەی دەهێنا ئەوە ئاسایی بوو. بەڵام دوو جار هەستی بە لاوازی کرد و سەری گێژی خوارد ئەمانە ئەوی تووشی دڵەڕاوکێی دەکرد.

گوتی:" نامومکینە، من کۆتا نایەم، لە بەرانبەر سەری کزی دانانێنم و نامرم. ئەویش کە ئێستا بە جوانی دێتە پێشەوە، خودا هێزم دەیە خۆڕاگر بم. سەدجار ئەی باوکی ئێمە و سەدجار ئەی حەزرەتی مریەم دەخوێنم. بەڵام ئێستا ناتوانم بخوێنم."

بە خۆی گوت، وا ئەژماریکە کە خوێندووتە. دواتر دەیخوێنم. لەو ساتەدا کە گوریس لە هەر دوو دەستەکەیدا بوو لە ناکاو کەوتە ڕاتەکین. جووڵانەوەکان توونە دژوار و قورس بوو.

بە خۆی گوت خەریکە بە نێزەکەی بە سیمی سەر گوریسەکە دەکوتێ، چاوەڕوانی بووم . دەبوا ئەم کارەی بکردایە بەڵام بەم کارە ئەگەری هەیە لە ئاوەکە دەرپەڕێت. باشترە ئێستا هەر بەم شێوەیە بسووڕێتەوە. پێویستی بە هەڵبەزینەوە هەیە. دواتر بە هەر بازێک ئەگەری هەیە برینی قولاپەکە بڵاوتر بێت و ماسی خۆی ڕزگار کات.

گوتی:" ماسی باز مەدە بازمەدە ماسی. "

ماسی چەن جاری دیکە بە تەنافەکەیدا کێشا و پیرەمێرد هەر جار سەری تەکان دا و بڕێک گوریسی بۆ شل کرد.

بە خۆی گوت دەبێت ئازارەکەی هەر لەو ئاستەدا بهێڵمەوە. ئازاری من گرینگ نییە. دەسەڵاتەکەی بە خۆمە. بەڵام ڕەنگە ئەو ئازارە شێتی کات.

ماوەیەکی کە پێ چوو ماسی ئیدی بە تەنافەکەیدا نەکوتا و هێواش دەستی کرد بە سووڕانەوە. بەڵام پیرەمێرد دیسان هەستی بە لاوازی و گێژییەک کرد. بەدەستی چەپی ناولپێک ئاوی زەریای هەڵگرت و بەسەر و دەم و چاویدا کرد. دیسان ڕشتی و دەستی بە پشتە ملیدا هێنا.

گوتی هیچ کوێم برین نییە. ئێستایە کە بێتە دەرەوە من هێز و ورەم هەیە. دەبێت توانات هەبێت هیچ باسی دیکە مەکە.

لەسەر تەختەکە دانیشت و ساتێک گوریسەکەی خستەوە سەر شانی. گوتی ئەو کە ئێستا بازنەکە دەور لێدەداتەوە بڕێک بحەسێمەوە. کاتێک کە گەڕاوە دیسان دەست پێ دەکەم.

حەسانەوە لەسەر تەختەکان بۆ ئەو زۆر چێژ بەخش بوو حەزی دەکرد ماسی بۆ خۆی بسووڕێتەوە بێ ئەوەی کە گوریسێکی داتێ. بەڵام چون لە گوشاری گوریسەکە ئاگادار بووە کە ماسی خەریکە دیسان بەرەو بەلەمەکە دێت پیرەمێرد بە تەواوی قیتەوە بوو دەستی کرد بە خۆ بەردانی دەست و شانەی و وەرگرتنەوەی ئەو گوریسەی کە بەر دەستی دەهاتەوە.

بە خۆی گوت هیچکات هێندە هیلاک نەببووم. ئێستا بای هاو ئاهەنگ خەریکە هەڵدەکات. بەم بایە دەتوانم ماسیەکە ببەم بۆ بەندەر. زۆرم پێویست بەم بایەیە.

گوتی:" ئەمجار کە دوور ڕۆیشت دەحەسێمەوە. ئێستا زۆر باشترم. دوای دوو سێ سووڕانەوەی دیکە دەیگرم."

کڵاویە قامیشییەکەی بە پشتە ملیەوە هەڵواسرابوو. کاتێک کە هەستی کرد ماسی خەریکە دەسووڕێتەوە بە ڕاکێشانی گوریسەکە لەسەر تەختەکە خەوت.

بە خۆی گوت ئەی ماسی ئێستا بڕۆ بە دوای کارەکانت، کاتێک گەڕایتەوە دەتگرم.

شەپۆلەکان بەرز ببوونەوە. بەڵام نەسیمێکی هێواش زەریای دەشەکاندەوە کە پیرەمێرد بۆ گەڕانەوە پێویستی پێی بوو.

گوتی:" من تەنیا سۆکانەکە بەرەو باشور و ڕۆژئاوا دەگرم، مرۆڤ هیچکات لە زەریادا ون نابێت، دورگەی ئێمەش دوور و درێژە."

دەوری سێهەم بوو کە بۆ جاری هەوەڵ ماسییەکەی دی.

هەوەڵ جار سێبەرێکی ڕەش بوو لە ژێر بەلەمەکەوە تێپەڕی و هێندە درێژ بوو کە پیرەمێرد بڕوای نەدەکرد.

گوتی:" نا بەم گەورەییە نابێت."

بەڵام هەر بەو گەورەییە بوو.لە کۆتایی ئەم سووڕانەوە تەنیا لە سی میتری بەلەمەکە هاتە سەر ئاو و پیرەمێرد کلکی دی کە لە ئاو هاتە دەرەوە. لە دەمی داسێکی گەورە درێژتر دەچوو. لەسەر ئاوە شینە تاریک ڕەنگێکی بەنەوشی دەنواند. تێخەکە چووە ژێر ئاو و چون ماسییەکە ڕاست لە ژێر ئاو مالەی دەکرد پیرەمێرد جەستەی گەورەو و هێڵە ئەرخەوانییەکانی پشتی دەدی.

باڵەکەی پشتیوەوەی کەوتبوو، باڵە گەورەکانی هەر دوو لای بە تەواوی کرابوونەوە.

لەم دەورەدا پیرەمێرد توانی چاوی ماسییەکە ببینێت، دوو ماسی بۆڕیش لە ژێریەوە مەلەیان دەکرد. بینی جاری وا پێیەوە دەنووسان جاری وا لێی جوودا دەبوونەوە. جاری وا هێواش لە سێبەرەکەیدا مەلەیان دەکرد. هەرکامیان پتر لە میترێک درێژییان بوو کاتێک بە خێرایی مەلەیان دەکرد تەواوی جەستەیان وەک مارماسی دەجوولاەوە.

پیرەمێرد خەریک بوو ئارەقی دەڕشت، بەڵام نە تەنیا لە تاوی خۆر، بە هەر سووڕانەوەیەک کە ماسی دەیدا ئەو گوریسەکەی دەگرتەوە. بڕوای بوو کە دوای دوو سووڕانەوەی دیکە دەتوانێ نێزەکەی لە جەستەی ڕۆکات.

بەڵام بە خۆی گوت دەبێت ڕێگا بدەم نیزیک و نیزیک تر بێتەوە. نابێ بیدەی لە سەری دەبێت بیدەی لە دڵی.

گوتی:" پیرەمێرد هێوەر بەو بەهێز."

لە سووڕانەوەی دیکەدا پشتی ماسی لە ئاوەکە هاتە دەرەوە، بەڵام بڕێک لە بەلەمەکە وە دوور بوو. لە سووڕانەوەی دوای ئەویش دیسان مەودای زۆر بوو بەڵام پشتی لەسەر ترەوە بوو . پیرەمێرد بڕوای بوو کە بڕێکی دیکە گوریسەکە بکێشێتەوە ماسییەکە بۆ لای بەلەمەکە ڕادەکێشێت.

دەمێکە بوو نێزەکەی قیت ڕاگرتبوو و ئاڵقەی گوریسە ناسکەکەی لە سەوەتێکی خڕدا بوو کلکی گوریسەکەی بە کۆڵەکە چکۆلەی تەختەکەوە بەستبووە.

ئێستا ماسی خەریک بوو هێواش دەسووڕایەوەو بۆ پێشێ دەهات. جوان بوو تەنیا کلکە گەورەکەی دەجوولایەوە. پیرەمێرد هەرچەندەی دەتوانی دەیکێشاو نیزیکتری دەکردەوە. ساتێک ماسی تلێکی خوارد دواتر خۆی ڕاستەوە کرد دەستی کرد بە سووڕانەوە.

پیرەمێرد گوتی:" تلاندمەوە، هەر ئێستا تلاندمەوە. "

ئێستا دیسان هەستی بە لاوازی و گێژ بوونێک دەکرد. بەڵام گوریسی ماسییە گەورەکەی بەردەوام بە دەستەوە بوو. بە خۆی گوت ماسییەکەم تلاندەوە. ڕەنگە ئەم جار بتوانم بە ئێجگاری گیانی بکێشم. گوتی ئەی دەستەکان ڕایکێشن. ئەی لاقەکان پتەو بن. ئەی سەر خۆڕاگرە. تۆ هیچ کات پشتت تێ نەکردووم و لەگەڵما ماویتەوە ئەمجار دەیگەڕێنمەوە.

بەڵام کاتێک تەواوی هێزی دا و بڕێک پێش لەوەی ماسی بە لاشانی بەلەمەکە بگات، بە تەواوی هێزی هەوڵی دەدا، ماسیی نیو تلێکی خوارد و گەڕاوە و دواتر خۆی ڕاست کرد و دوور بووە.

پیرەمێرد گوتی:" ماسی ئەی ماسی تۆ کە هەر دەبێت بمری و ڕۆحت دەکێشم بۆ دەبێت منیش بکوژی؟"

بە خۆی گوت بەم کارە هیچ شتێک درووست نابێت دەمی هێندە وشک بوو کە نەیدەتوانی قسەکات. بەڵام ئێستا دەستی بە جێ ئاوەکە نەدەگەیشت. گوتی ئەم جار دەبێت بیهێنمە تەنیشت بەلەمەکە. ئیدی تاقەتی چەن سووڕانەوەی دیکەم نییە. بەڵام بە خۆی گوت با هەتە، تۆ هەمووکات هێز و قەوەتت هەیە.

جاری دیکە هێندەی نەمابوو کە کارەکە ئێجگاری کات دەستی پێی بگات بەڵام ماسی دیسانەوە خۆی ڕاست کردەوە هێواش دوور کوتەوە.

پیرەمێرد لە دڵی خۆیدا گوتی ماسی تۆ خەریکی من دەکوژی. بەڵام حەقی خۆتە . ئەی برا من تا ئێستا لە ژیانمدا  لە تۆ گەورەتر و جوانتر و هێوەرتر و لەسەرە خۆترم نەدیوە. بێ من بکوژە. هەرکەس هەرکام دەکوژێ با بیکوژێ.

بەخۆی گوت مێشکت خەریکە تێک دەشێوێت. ئاگادار بەوە. ئاگادار بەو خۆڕاگرانە تر و پیاوانەتر بە باوەشی ئاواڵە ئازارەکە لە خۆ بگرە، یان وەک ماسی.

بەڵام بە دەنگێک کە بە دژواری دەبییست گوتی:" مێشک گەشاوەبە، گەشاوە."

دوو دەوری دیکەش هەر بەم شێوە بەردەوام بوو.

پیرەمێرد بە خۆی گوت دووبارە، هەرجار کە هەستی دەکرد خەریکە دەبوورێتەوە. دەیوت دووبارە. بەڵام جارێکی دیکە هەوڵ دەدەم.

جارێکی دیکە هەوڵی دا کە خەریک بوو دەبووراوە کە ماسییەکە وەرگەڕێنێتەوە. ماسییەکە خۆی ڕاست کرد و دیسان دوور بووە و کلکی گەورەی لە ئاو جووڵاندەوە.

پیرەمێرد بە خۆی بەڵێنی دابوو کە دیسان هەوڵ بدات. هەرچەن کەدەستەکانی ماندوو ببوون و چاوەکانی ڕێشکەوپڕێشکەیان دەکرد  و تەنیا لە کات گەلێکدا بە جوانی دەیاندی.

دیسان هەوڵی دا و دیسان هەر بەو شێوەیە بوو. گوتی باش و هەستی کرد کە خەریکە دەبووریێتەوە کە دیسان ئاگادار بووە جارێکی دیکە هەوڵ دەدەم.

تەواوی ئێش و هێز و ئەوەی ورەی کۆن لە ناخیڕا بوو کۆی کردەوەو لەسەر گیان کێشانی ماسییەکە داینا. ماسی هاتە تەنیشتی و نەشمیلانە مەلەی کرد، بە شێوەیەک کە نێزەکەی لە بەلەمەکە دەدرا. و ماسی، درێژ، قووڵ، پان، زێڕین، هێڵە ئەرخەوانییەکان بە پشتەوە. لە ژێر بەلەمەکەوە دەڕۆیشت و نەدەگەیشتە کۆتایی.

پیرەمێرد گوریسەکەی بەرداوەو لاقی لەسەری دانا و نێزەکەی هەڵگرت و تا ئەو شوێنەی کە توانی بەرزی کردەوە بە تەواوی هێزی و هێزێک کە ئێستا  وەدەستێ خستبوو، هێنایە خوارەوە لە سنگی ماسیی ڕاست لە ژێر باڵە گەورەکەی سنگی کە بە گەورەیی سنگی مرۆڤ کرابووە ڕۆ کرد. هەستی بە ڕۆ کردنی ئاسنەکە کرد و خۆی لەسەری دانا. زۆرتر بردییە ژوورەوە تەواوی کێشی خۆی لەسەری دانا کە ئازار بگەیەنێتە دڵی.

گیانی ماسییەکە بە نووکی نێزەکە ڕاکێشرا دەرەوە. بەدوای ئەو ماسی لە ئاوەکە هەڵبەزییەوەو هەرچی جوانی و شان و شکۆی خۆی لەسەر ئاوەکە پیشان دا. دەڵێی لە سەرەوەی پیرەمێرد هەڵواسرابوو. دواتر بە لێدانێک کەوتە خوارەوەو بارانێک بەسەر پیرەمێرد تەواوی بەلەمەکە باری.

پیرەمێرد دڵی تێک هەڵدەهات و حاڵی خراپ بوو. چاوەکانی لێڵ بوون بە باشی نەیدەدی. بەڵام گوریسی نێزەکەی کردەوە و هێواش لە نێو دەستە زامدارەکانی بۆ زەریای نارد. کاتێک کە ڕووناکییەک هاتەوە چاوەکانی توانی ببینێت ماسی بە پشت گەڕاوەتەوە زگی سپی بەرو سەرەوەیە. داری نێزەکە لار لە شانی ماسییەکە هاتبووە دەرەوە، ئاوی زەریا لە خوێنی دڵی ڕەنگاوی ببوو. خوێن هەوەڵ تاڵ بوو، وەک پۆلێک ماسی لە ئاوی شین لە قووڵایی هەزار باڵا، دوایی وەک هەور پرژ و بڵاو بوو، ماسی زێوین هێواش لە ئاودا تلی دەخوارد.

پیرەمێرد بە چاوە کزەکانیەوە سەیری کرد. ئەوکات گوریسی نێزەکەی دوو دەور بە کۆڵکە چکۆلەی تەختەکەوە سووڕاند و سەری خۆی لەسەر دەستەکانی دانا.

لەسەر تەختەکە گوتی:" مێشکم گەشاوە ڕاگرە، من پیرەمێردێکی هیلاکم بەڵام ئەم ماسییە کە برام بوو کوشتم ئێستا دەبێت بێگاری بکەم."

بە خۆی گوت ئێستا دەبێت تەناف و ئاڵقەکان ئامادە بکەم و ئەو لە پەنای بەلەمەکە ببەستمەوە. گەر دوو کەس بایین بەلەمەکەمان بە لاشان دەخست کە ماسییەکە بکێشینە سەرەوە دواتر ئاوی بەلەمەکەمان خاڵی دەکرد، هەر چەن ئەم ماسییە لەم بەلەمە جێ نابێتەوە. دەبێ هەموو شتێک حازر کەم. دواتر بیکێشمە پێشەوەو باش بیبەستمەوە. کۆڵەکەکە قیت کەم و چارۆگەکانی لێدەم وبگەڕێمەوە.

دەستی کرد بە کێشانی ماسی بۆئەوەی شان بە شانی بەلەمەکە بێنێت و بتوانێ گوریسەکە لە لای گوێیەوە ببات و لە دەمیەوە دەری بێنێت و سەری توونند بە پێشەوەی بەلەمەکە ببەستێتەوە. بە خۆی گوت دەمهەوێت ببینم و دەستی لێدەم هەستی کەم گوتی ئەمە دارایی منە. بەڵام بۆ ئەوەی نییە کە دەمهەوێت هەستی کەم. دەڵێی دڵیم هەست کرد. کاتێک نێزەکەم دوو جار لێی ڕۆ کرد، ئێستا بیکێشە پێشەوە بیبەستەوە ئاڵقەی تەنافەکە بخە دەوری کلکی ئاڵقەیەکی دیکە بە ناو قەدی، بیبەستەوە بە بەلەمە کە.

گوتی:" دەست پێ بکە پیرەمێرد." قومێکی ئاو خواردەوە. " ئێستاکە شەر تەواو بووە بێگارییەکی زۆر ماوە."

سەیرێکی ئاسمانی کرد و دواتر چاوێکی لە ماسییەکە کرد. بە وردی چاوی لە خۆر کرد. بە خۆی گوت ئێستا زۆر لە نیوەڕۆ تێنەپەڕیوە. بای هێوەر خەریکە بەرز دەبێتەوە. گوریسەکە ئێستا گرینگ نییە. من و کوڕەکە لە ماڵەوە دەیانخەینەوە سەر یەکتری.

گوتی:" ماسی، وەرە با بتبینم." بەڵام ماسی نەهات لە نێو ئاوەکە بڵاو بوو، و پیرەمێرد بەلەمەکەی بە لای ئەودا ڕاکێشا.

کاتێک کە لە بەرانبەری ئەو ڕاوەستا و سەری ماسی لەسەر سینەی بەلەمەکە هات بڕوای بە بارمتایی ماسییەکە نەدەکرد، بەڵام تەنافی نێزەکەی لە کۆڵەکەکە کردەوە لە ژێر گوێی ماسییەکەوە بردی و لە دەمیەوە دەری هێنا و بە دەوری نێزەی ماسییەکە گرێی دا. دواتر لە ژێر گوێکەی دیکەیەوە بردی و جارێکی دیکە بە دەوری نێزەکەی سووڕی دا و دوو لا تەنافەکەی

گرێ دا و بە کۆڵەکەی تەختەکەوە گرێی دا. دوایی تەنافەکەی بڕی و چووە پشتەوەی بەلەمەکە کە کلکەکە ببەستێتەوە. ڕەنگی ماسی لە ئەرخەوانی و زێوی بە زێوییەکی تەواو هەڵگەڕابوو. لەسەر کلکی هێڵەکان هەروا بەنەوشی کاڵ بوون. هێڵەکان لە بستێک پانتر بوون و چاوەکانی ماسی هیچ ڕوویەکیان نەبوو وەک شووشەی دووربینی ژێر ئاوییەکان یان چاوەکانی شێوە قەشەی پێش دەم تاقمە پرسەکان.

پیرەمێرد گوتی:" تەنیا ڕێگای کوشتنی هەر ئەمە بوو." لە ساتێک کە ئاوەکەی خواردەوە هەستێکی باشتری بوو و دەیزانی کە نابووڕێتەوە و مێشکی گەشایەوە. بە خۆی گوت ئەم شێوەی کە دەبینم سێسەد کیلۆ کێشی هەیە رەنگە زۆرتر گەر دوو سێیەمی ئەم کێشە لە کیلۆی شەست سێنت دانێین دەبێتە چەند؟

گوتی:" دەبێت بە قەڵەم بیژمێرم. مێشکم چاک کار ناکات. هەست دەکەم دی ماجۆی گەورە ئەوڕۆ زۆر لێم ڕازی بێت. من مێخەکی ئێسکیم نەبوو بەڵام دەستەکانم و پشتم بەڕاستی دێشێت." بە خۆی گوت مێخەکی ئێسکی چ شتێکە؟ ڕەنگە هەمانبێت و خۆمان نەزانین.

ماسییەکەی بە پێشەو دواوەو نێوانی بەلەمەکە توونД بەستەوە هێندە گەورە بوو کە دەڵێی بەلەمێکی گەورەمان بەو بەلەمە چکۆلە بەستووەتەوە. پیرەمێرد لەتێک گوریسی بڕی و لێواری خوارەوەی ماسییەکەی بە نێزەکەیەوە بەست بۆ ئەوەی دەمی نەکرێتەوە و بەلەمەکە بە باشی بەرەو پێش بڕوات.

دواتر کۆڵەکەکەی بەرزەوە کرد و چارۆگە پینەدارەکەی هەڵکێشاو بەلەمەکە کەوتە ڕێ و پیرەمێرد کە بە پێشەوە بەلەمەکە پاڵی دابوو بەرەو باشووری ڕۆژئاوا لێی خوڕی.

پێویستی بە پێوەری جەمسەری نەبوو کە بزانێ باشووری ڕۆژئاوا لە کوێیە. هەر ئەوەندەی دەویست هەست بە با بکات و ڕاکێشانی بەلەمەکان ببینێت. باشترە قولاپێکی چکۆلە بە کەوچکەکەوە بخەمە نێو ئاو بەڵکوو شتێک ڕاو کەم و بیخۆم، بۆ ئوەی بە نمەکەی گەرووم تەڕ کەم. بەڵام کەوچکی نەدۆزییەوەو ساردینەکانی هەموو بۆگەن ببوون. بۆیە مشتێ گیای زەریایی زەرد کە لە پەنایەوە دەڕۆیشت بە گۆچانە سەر نووشتاوەکەی گرت. ڕایوەشاند بە شێوەیەک ئەنگوشەکانی کە لە نێویدا بوون کەوتنە سەر تەختی بەلەمەکە. پتر لە دە دوازدەدانە دەبوون. وەک قاڵۆنچە خۆڵییەکان دەست و لاقیان دەجووڵاند، پیرەمێرد سەرەکانیانی بە قامک هەڵکەند و خستییە دەمیەوە بە پێست و کلکەوە جاوی. ئەنگوشەکان زۆر ورد بوون بەڵام پیرەمێرد دەیزانی وزەی زۆریان هەیەو جێژبەخشیشن.

پیرەمێرد ئێستاش دوو قوم ئاوی مابوو، دوای خواردنی ئەنگوشەکان نیوە قومێکی خواردەوە. بەلەمەکە بەو بایەی کە دەهات چاک بەرەو پێشێ دەڕۆیشت، و پیرەمێرد داری سۆکانەکەی لە ژێر باڵی گرتبوو و بەلەمەکەی ڕێنوێنی دەکرد، ماسی دەبینی و پێویست بوو سەیری دەستەکانی کات، یان پشتی بە بنچنی بەلەمەکەدا بێنێ بۆ ئەوەی بزانێ بەڕاستی ڕووی داوە یان نا. ساتێک لە کۆتایی کارەکە هێندە حاڵی خراپ ببوو کە بە خۆی گوتبوو ڕەنگە خەون دەبینم. ئەوکات ماسییەکەی بینیبوو کە

لە ئاو دێتە دەرەوە و پێش کەوتنە خوار لە هەوادا بێ جووڵە ماوە. دڵنیا بوو کە لەگەڵ شتێکی سەیر و سەمەر تێکەوتووە، هەرچەن نەیتوانی بڕوای پێ کات. دوای ئەوەش چاوەکانی بە باشی نەیدەدی و ڕەش هەڵدەگەڕان، بەڵام ئێستا وەک هەمووکات بە باشی دەیاندی.

ئیدی دەیزانی کە ماسییەکەی وەچنگ خستووە و دەستەکانی و پشتی خەون و خەیاڵ نییە. بە خۆی گوت دەستەکانم بە زوویی چاک دەبنەوە، خوێنەکانیانم بە باشی شۆردەوە، ئاوی سوێر چاکیان دەکاتەوە. ئاوی ڕەشی ناو دڵی کەنداو باشترین دەرمانی برینە. تەنیا کار ئەوەیە کە مێشکم گەشاوە بێڵمەوە، دەستەکان کاری خۆیان کردووە، خەریکین باش دەچینە پێشەوە. دەمی ماسییەکەم بەستۆتەوەو کلکیم قیت لە سەرەوە بۆ خوارەوە ڕاگرتووە، وەک دوو برا بەیەکەوە دەچینە پێش. دواتر بڕێک کەوتە گومانەوە، وتی ئەو خەریکە من دەبات یان من ئەو؟ گەر ئەوم بە دوای بەلەمەکە ڕادەکێشا گومانێک نەبوو، یان گەر ماسی کەوتبووە نێو بەلەمەکە هەموو شکۆی لە دەس دابوو ئەوەجێ گومانێک نەبوو. بەڵام ئێستا هەردووک خەریک بوون لە تەنیشت یەکتری ئاوەکەیان هەڵدەدڕی. پیرەمێرد گوتی گەر حەز دەکات ئەو من ببات ڕێگا بدە کە بیبات. من تەنیا لە فێڵ و کەڵەکە لەو سەرترم و ئەو هیچ خەیاڵێکی خراپی بۆ من نەبوو.

باش دەچوونە پێش و پیرەمێرد دەستی لە ئاوەکەدا تەڕ دەکرد و هەوڵی دەدا مێشکی گەشاوە بێڵێتەوە. هەورە بەرزە و چڕی کۆمۆلۆسەکان لە ئاسماندا بوون بەرزتر لەوان هێندە هەوری سیرووس خۆیان کێشابووە. کە پیرەمێرد بزانێت کە ئەم بایە

تەواوی شەو درێژەی دەبێت. پیرەمێرد بەردەوام سەیری ماسییەکەی دەکرد بۆ ئەوەی ئەرخەیان بێت کە ڕاستە.کاتژمێرێک دواتر هەوەڵ سەماسیە زەفەری بۆ هێنا.

هاتنی سەماسیەکان هەڵکەوت نەبوو. بە نیشتنەوەی هەورە خوێنەکان و بڵاوبوونەوەی لە ئاو سەماسیەکە لە قووڵایی هەزار باڵای زەریا هاتە سەرەوە. هێندە بە خێرایی هاتە سەرەوە و هێندە نەترسانە کە ڕووی شینی ئاو هەڵدڕا و دەرکەوت. ئەو کات دیسان چووەوە نێو ئاوەکە بە دوای خوێنەکە کەوت و لە شوێنێک کە بەلەم و ماسییەکە تێپەڕیبوون ڕێکەوت.

جار وا ڕێ و شوێنی خوێنەکەی ون دەکرد، بەڵام دیسان دەیدۆزییەوە. یان تەنیا هێمایەک لەو. خێراو بەپەلە لەو شوێنەوە دەچوو، سەماسیە ماکۆیەکی زۆر گەورە بوو. دەیتوانی لە زەریادا بە چەشنی خێراترین ماسییەکان مەلە بکات. هەموو شتێکی جوان بوو، بێجگە لە کەڵپەکانی، گەردەنی وەک شمشێر ماسی شینکی بوو و زگی مسی و پێستی ساف و جوان بوو. سیمای وەک شمشێر ماسی بوو بێجگە لە کڵپە گەورەکانی کە ئێستا توون وێکی نابوو. سەماسیە قیت لە ژێر ئاو بە خێرایی مەلەی دەکرد. باڵی پشتی بێ جووڵە ئاوی بەچەشنی چەقۆیەک هەڵدەدڕی. پشت لیوەکانی دوو دوو قەراغ کڵپەکانی هەموو ترس هێنەر ڕیز ددانکانی بۆ ناوە نووشتابوونەوە. ئەم ددانانە لە ددانانەی سەماسیەکانی دیکە نەبوو. وەک قامکی دەستی مرۆڤ بوون کە بە شێوەی چڕنۆکی هڵۆ نووشتا بوونەوە. ڕەنگە بە درێژایی قامکی پیرەمێرد دەبوون و هەردوو لای ئەوان وەک تێخ تیژ بوو. ئەم ماسییە بە شێوەیەک درووست کرابوو کە بتوانێ هەموو

ماسییەکانی زەریا بخوات. هێندە خێرا و بەهێز و پۆشتە بوو کە هیچ بەرانبەرێکی نەبوو. ئێستا کە بۆی خوێنی تازەی پێگەیی. خێرایەکەی زۆر کرد. باڵی پشتەوەی ئاوەکەی هەڵدەدڕی.

پیرەمێرد هەر ئەوەیکە ئەوی دی زانی کە ئەمە سەماسیەیەکی چەتوونەو ترس ناناسێت هەر کارێکی کە بیهەوێت دەیکات. هەروا کە سەیری سەماسیەکەی دەکرد کە خەریک بوو نیزیک دەبووە. نێزەکەی حازر دەکرد و تەنافەکەی دەبەست. تەنافەکەش کورت بوو، چونکە بڕێکی بۆ بەستنی ماسییەکە بڕیبوو.

ئێستا مێشکی پیرەمێرد گەشابووە و باش کاری دەکرد و پیرەمێرد پێداگر بوو. بەڵام هێندەشی هیوا نەبوو. بەخۆی گوت کە ڕاوەستان بێ سوودە، نیزیک بوونەوەی سەماسیەکەی سەیر دەکرد و چاوێکی بە ماسییە گەورەکەدا گەڕاند. گوتی دەڵێی خەونە پێش لە هەڕەشەکەی ناتوانم بگرم، بەڵام ڕەنگە بتوانم لە ناوی ببەم، گوتی ئەی ددانی چارەت دەکەم.

سەماسیەکە بە خێرایی خۆی بە دواوەی بەلەمەکە گەیاند و کاتێک لە ماسییەکەی دا پیرەمێرد کرانەوەی دەمی دی، و چاوە نامۆکانی، و دەنگە بەیەک گەیشتنی ددانەکانی کە ڕاست لەسەر کلکی ماسی بوو و لە گۆشتەکە ڕۆچوو. سەری سەماسیەکە لە ئاوەکە بەدەرەوە بوو و پشتیشی خەریک بوو دەهاتە دەرەوە و پیرەمێرد دەنگی پچڕانی پێست، و گۆشتی ماسییە گەورەکەی دەبیست. و توند نێزەکەی بە سەماسیەکەدا ڕاکێشا لە شوینی پێک گەیشتنی نێو چاوان و هێڵێک کە لە ژێر ملیەوە دەگەیشتە لووتی. تەنیا ئەو سەرە قورسە شینەی بوو و ئەو چاوە گەورە و ئەو کڵپە تیژ و ڕاکێشەر و قووتار هێنەر. بەڵام جێگای مێشک هەر

ئەو خاڵە بوو کە پیرپیاو پێکای. بە دەستە بریندارە خوێناوییەکانی و بە تەواوی هێزیەوە نێزەکەی بە باشی بە ئامانجەکەی گەیاند. بێ هیوا لێی دا. بەڵام بە ی‌ڕیار و بە قینێکی تەواوە.

سەماسیەکە تلێکی خوارد و گەڕاوەو پیرەمێرد چاوە مردووەکانی بە ڕوونی بینی و ئەوکات سەماسیەکە تلێکی دیکەی خوارد و خۆی لە دوو ئاڵقە تەنافەکە پێچا. پیرەمێرد دەیزانی کە سەماسیەکە مردووە بەڵام سەماسیەکە وەخۆی نەدەخست. ئەوکات پانەوە بوو. کلک و چەناکەی یەک بە دوای یەک بە ئاوەکەدا دەکوتا ودواتر وەک بەلەمە متۆڕییەکان لەسەر ئاوەکە ڕۆیشت. ئاو لە کوتانی کلکی سپی ببوو سێ چوارەمی لەشی لە ئاوەکە بەدەرەوە بوو کە تەنافەکە کێشرا. جووڵاو بڕا. سەماسیە ساتێک لەسەر ئاو مایەوە و پیرەمێرد چاوی لێ کرد دواتر زۆر هێواش چووە نێو ئاوەکەوە لە وێدا نوقم بوو.

پیرەمێرد بە دەنگی بەرز گوتی نیزیکی بیست کیلۆ گۆشتی برد. و بە خۆی گوت نێزەو تەنافەکەشی برد، ئێستا دیسان لە ماسییەکەی من خوێن دەچێت و دیسان سەماسیەکان دێن.

ئێستا کە ماسییەکە تووشی نوقسان ببوو نەیدەویست سەیری ماسییەکە بکات. کاتێک کە سەماسیەکە لە ماسییەکەی دا و هرووژمی بۆ برد وەک ئەوەی وابوو لە خۆی دراوە.

بە خۆی گوت بەڵام سەماسیەیەک کە پەلاماری ماسییەکەی دا کوشتم. ئەمە گەورەترین ددانداریک بوو کە دیومە .و خودا بۆ خۆی دەزانێ کە من سەماسیگەلی گەورەم دیوە.

به خۆی گوت باشتر لەوەی بوو کە بۆم بمێنێتەوە. بریا خەوم دیبوو و ئەم ماسییەم نەگرتبوو. و ئێستا لە نێو پێخەفەکە لەسەر ڕۆژنامەکان تەنیا خەوتبووم.

" بەڵام مرۆڤیان بۆ دۆڕان ساز نەکردووە. مرۆڤ ڕەنگە لە ناو بچێت بەڵام نادۆڕێ. " بەخۆی گوت بەڵام بەداخەوەم کە ئەم ماسییەم کوشت. ئێستا گێچەڵ لە پێشە، من تەنانەت نێزەشم نییە. ددان گایینجە ئاژەڵێکی بێ بەزەیی و تواناو بەهێز و زیرەکە. و من تەنانەت نێزەشم نییە بەڵام من لەو زیرەکترم بووم. گوتی ڕەنگە نەش بووم. ڕەنگە تەنیا چەکی من باشتر بوو.

بەرز گوتی:" پیرەمێرد بیر مەکەوە ڕێگاکەت بگرە بەر و بڕۆ هەرکات هات لەبەرانبەریانا ڕاوەستە."

به خۆی گوت بەڵام دەبێت بیر کەمەوە، چون جگە لەمە شتێکم بۆ نەماوەتەوە. هەر ئەمەوەو بەیس باڵ. گەر دی ماجۆی گەورە دەیدی کە چۆن بە مێشکیا کوتام نازنم چی دەوت. هونەرێکی گەورە نەبوو.هەرکەسێک دەتوانێ یانی دەستەکانی من بە ئاستی مێخەکە ئێسکییەکان ئەرکیان بوون؟ لە کوێ بزانم؟ پاشنەی لاقەکانم هیچ کات نوقسانیان نەبووە تەنیا ئەو ڕۆژەی کە کاتی مەلە کردن لاقم لەسەر بەردماسییەکە داناو ژارەکەی پێ ڕشتم. لە ئەژنۆ بۆ خوارەوە فەلەجی کردم و لە ئێشی ئۆقرەم نەمابوو.

گوتی:" لە بیری شتە بەکەیفەکان بە پیرەمێرد. ئێستا هەر خولەک و بە بەندەر نیزیک دەبیەوە بیست کیلۆ گۆشتت بە فیڕۆ داوە سووکتریش بووی."

باش دەیزانی کە کاتێک ڕەوەتی سووڕانەوەی کەنداو دەبێت چ پێش دێت بەڵام ئێستا هیچ کارێک ناتوانێ بکات.

" بۆچی کارێک دەکرێ بکردرێ. دەتوانم چەقۆکەم بە سەری یەکێ لە سەوڵەکان بەستمەوە."

سوکانەکەی دایە بن باڵی  و لاقەکانی لەسەر قەراغی چارۆگەکە داناو چەقۆکەی بە سەوڵەکەوە گرێی دا.

گوتی :" باشە من هەر ئەو پیرەمێردەم بەڵام بێ چەک نیم.'

کزەبایەکی فێنک دەهات و بەلەمەکە بۆ پێش دەچوو. پیرەمێرد تەنیا لە بەشی پێشەوەی ماسی چاوی بڕیبوو، بڕێک هیوای بۆ گەڕایەوە.

بە خۆی گوت بێهیوایی حەپۆلانەیە. ئەمەش کە هیچ، بە بڕوای من گوناهە. بیر لە گوناه مەکەوە. ئێستا بێ گوناه بەئیشتیا گێچەڵت هەیە. ئەمەش هیچ، من لە گوناه سەر دەرناهێنم.

من لە گوناه ناگەم و گومان ناکەم بڕوام بە گوناه هەبێت. ڕەنگە کوشتنی ماسییەکە گوناه بوو. گومان دەکەم گوناه بووبێت. هەر چەن ئەم کارەم کرد بۆ ئەوەی زیندوو بمێنم و خواردنی خەڵک بدەم. گەر ئەمە گوناهە،هەموو کارەکان گوناهە. بیر لە گوناه مەکەوە. کار لەم قسانە تێپەڕیوە مرۆڤ گەلێک هەن پارە وەردەگرن و گوناه دەکەن. بێڵە ئەوان بیری لێکەنەوە. تۆ ماسی گر بە دونیا هاتووی، بەو شێوەی کە ئەم ماسییە بەدونیا هاتووە. پێترۆسی پیرۆزیش ماسی گر بوو. بەو شێوەی کە باوکی دیماجۆی گەورەش ماسی گر بوو.

بەڵام حەزی دەکرد سەبارەت بە تەواوی ئەوانەی وا تێهەڵقوڵتانێکی لەگەڵیان بووە بیر کاتەوە. چون شتێک نەبوو بیخوێنێتەوە و ڕادیۆشی نەبوو. زۆری بیر دەکردەوە و لە بیری گوناهدا بوو. بە خۆی گوت تۆ ماسییەکەت تەنیا لەبەر ئەمە نەکووشتووە کە زیندوو بمێنیتەوە و گۆشتی بفرۆشی بۆ ناوبانگ ماسییەکەت کوشت. بۆ ئەوەی کە ماسیگری کاتێک کە زیندوو بوو خۆشت دەویست. دوای ئەویش خۆشت دەویست. گەر خۆشت بوێت کوشتنی تاوان نییە یان تاوانی زۆرترە؟

بەدەنگی بەرز گوتی:" پیرەمێرد خەریکی زۆر بیر دەکەیتەوە."

بەڵام لە کوشتنی ئەو ددان گایینجە بە کەیفی. ئەویش وەک تۆ ماسی دەخوارد. کەلاک خۆر نەبوو وەک چەنێک لە سەماسیەکانی دیکە ئامێرێکی ئیشتیای سەر ئاو نەبوو. جوان و پایەبەرز بوو و لە هیچ شتێک ترسی نییە.

بەدەنگی بەرز گوتی:" بۆ پاراستنی خۆم کوشتم باشیش کوشتم."

دوای ئەمانەش هەر شتێک بە شێوەیەک شتەکانی دیکە دەکوژێ. ڕاوە ماسیش من دەکوژێ. ڕاست بەو شێوەیەی کە من زیندوو دەهێڵێتەوە. بە خۆی گوت کوڕەکە من زیندوو دەهێڵێتەوە نابێ زۆر خۆم فریو بدەم.

نووشتاوە لەتێک لە گۆشتی ئەو شوێنەی وا سەماسیەکە برینداری کردبوو لێی کردەوە. جاوی و چۆنیەتی و چێژەکەی پێوا. وەک گۆشتی گا سفت و ئاودار بوو بەڵام سوور نەبوو دەمارەو ڕیشۆڵەی نەبوو و دەیزانی کە لە بازاڕ نرخێکی باشی بۆ دادەنێن

بەڵام هیچ ڕێگایەک نەبوو پێش لە بڵاو بوونی بۆنەکەی لە ئاو بتوانی بگریت و پیرەمێرد دەیزانی کە دۆخێکی زۆر نالەباری لە پێشە.

با بڕێک شوێنی خۆی لار کردبووە. بڕێک بۆ لای باکووری ڕۆژهەڵات وەرسووڕا بوو. پیرەمێرد دەیزانی کە ئەمە یانی با نانیشێتەوە سەیری بەرەو پێش چوونی خۆی کرد. بەڵام نە چارۆگەیەک بەدەرەوە بوو نە کەشتی و نە دووکەڵێک. تەنیا ماسییە باڵندەکان لە پێش بەلەمەکەوە بەم لاو لا بازیان دەدا و لەتە گیا زەردەکانی کەنداو لە ئاوا وێڵ بوون. باڵندەیەکیش بە ئاسمانەوە نە بوو.

دوو کاتژمێر بەسەر چبوو کە پیرەمێرد بەلەمەکەی لێ دەخوڕی. لەسەر تەختەی دواوەی بەلەمەکە ڕاکشابوو. جار وا لەتێک لە گۆشتی مارلینەکەی دەجوو. هەوڵی دەدا بڕێک بحەسێتەوە بۆ ئەوەی ورەی بەرز بێتەوە. ئەوکات یەک دوو سەماسیەیەکی دی.

بەدەنگی بەرز گوتی:" ئەی" ئەم دەربڕینە بە زمانێکی دیکە نابێت. ڕەنگە دەنگێک زۆرتر نەبێت وەک دەنگێک کە بێ دەسەڵات لە گەرووی مرۆڤ دێتە دەرەوە کاتێک کە بزمار لە دەستی ئەو ڕۆ دەچێت و لە تەختەکە دەدرێ.

بەرز گوتی:" گالانۆ" ئێستا باڵێکی دوو هەمی دیبوو کە بەدوای هەوەڵییەوە دەهات. و پیرەمێرد بە پێی باڵە قاوەیی ڕەنگ و سێگۆش شێوەکانیان و بزاڤی خێرای کلکەکانیان زانیبووی کە ئامانە لەو سەماسیە لمۆز پانانەن. لە بۆنی ماسی ئۆقرەیان نەمابوو و برسێتی بە شێوەیەک گێژیانی کردبوو کە گێژانە ڕێی

بۆنەکەیان ون دەکرد و دەیاندۆزییەوە. بەڵام بەردەوام نیزیکتر دەبوونەوە.

پیرەمێرد پەتی چارۆگەکەی بەستەوەو سوکانەکەی بێ تەکان ڕاگرت. دواتر سەوڵەیەک کە چەقۆکەی پێوە بوو هەڵگرت. زۆر بە نەرم و نیانی هەڵی گرت. چون دەستەکانی لە ئازار ئۆقرەیان نەمابوو. دەستەکانی لەسەر دەسکی سەوڵەکە وێک دێناوە بۆ ئەوەی نەرم تر بێت. دوایی دەستەکانی توند کرد بۆ ئەوەی ئازارەکە هەڵگرێت و نەیداتەوە. و سەرنجی سەماسیەکانی دەدا کە دەهاتن. سەری پان و نووشتاو و بێڵ شێوەیانی دەدی و باڵەکانی پشتییان کە نووکەکەیان سپی بوو. ئەمانە سەماسیەگەلی پۆخڵی بۆن پیسێکی کەلاک خۆر بوون کە لە ڕاویان دەدا و هەرکات برسییان بوو سەوڵ یان سوکانی بەلەمەکەشیان هەڵدەدڕی. هەر ئەم سەماسیانە بوون کە کاتێک کیسەڵەکان لەسەر ئاو لە خەودا بوون لاق و باڵەکانیان دەبڕی و گەر برسییان بایە مرۆڤیان لە ئاودا دەبرد. تەنانەت گەر بۆنی خوێن یان لینجی ماسی بە لەشی مرۆڤەوە نەبوایە.

پیرەمێرد گوتی:" ئای، گالانۆکان، بێن بزانم."

هاتن بەڵام نە بەو شێوەی کە سەماسیی " ماکۆ" هاتبوو. یەکیان گەڕاوەو لە ژێر بەلەمەکە ون بوو و کاتێک ماسییەکەی گاز گرت و کێشای پیرەمێرد هەستی بە جووڵەکەی کرد. ئەوی دی بە چاوە باریک و زەردباوەکانی سەرنجی پیرەمێردی دا و دواتر توند دەمە خڕەکەی کردەوە و هێرشی کرد و هەر ئەو شوێنە پچڕاوی ماسییەکەی گرت. لەسەری و ملی قاوەیی هێڵی یەکانگیری پشت و ملی بەجوانی دیار بوو. پیرەمێرد چەقۆی سەر

سەوڵەکەی لەو جوگمەیە ڕۆ کرد و دەری هێنا و دیسان لە چاوی زەردباوی پشیلە ئاساکەی ڕۆی کرد. سەماسیە ماسییەکەی بەردا و چووە ئاوەکە و بەردەوام کە خەریک بوو دەمرد ئەوەی کە لە ماسییەکە لێ کردبووە قووتی دەدا.

لە جووڵەیەک کە سەماسیەکەی دیکە بە ماسییەکەی دەدا بەلەمەکە ئێستاش دەلەرییەوە و پیرەمێرد تەنافی چارۆگەکەی بەردا بۆ ئەوەی بەلەمەکە بە لاشان بسووڕێتەوە و سەماسیەکە لە ژێری بێتە دەرەوە. کاتێک کە سەماسیەکەی دی بە لێواری بەلەمەکە نووشتایەوە و چەقۆکەی ڕۆ کرد. بەڵام چەقۆکە تەنیا ڕووشاندی و پێستی سەماسیەکە زۆر سفت و جیڕ بوو و چەقۆکە لەسەری کاری نەبوو. ئەم لێدانە نەتەنیا دەستی بەڵکوو شانەکانی هێنا ئێش و ئازارێکی خستە جستەیەوە. بەڵام سەماسی سەری لە ژێر ئاو هێنا دەرەوە بە خێرایی هێرشی کرد و پیرەمێرد ڕاست لە نێوان تەپڵە سەرە پانەکەی ڕاکێشا و لووتی کووسەکە لە ئاو هاتە دەرەوە و خۆی بەرەو ماسییەکە ڕاکێشا. پیرەمێرد چەقۆکەی دەرهێنا و دیسان ڕاست هەر لەوێی ڕۆ کرد. سەماسیەکە هەروا بە کڵپەکانی بە ماسییەکەوە گیر دابوو. و پیرەمێرد ئەمجارەیان چەقۆکەی لە چاوی ڕاستی ڕۆ کرد بەڵام سەماسیەکە نەدەکشا دواوە.

پیرەمێرد گوتی:" لێ نابیتەوە، نا؟" و چەقۆکەی لە نێوان مێشک و بڕبڕەی پشتی ڕۆ کرد. ئێستا دۆزینەوەی ئاسانتر بوو، پیرەمێرد پچڕانی پەیوەندیەکەی هەست پێ کرد. پیرەمێرد سەوڵەکانی سەر و بن کرد و تیژییەکەی لە نێو کڵپەکانی سەماسیەکە دانا و سووڕاندی کە دەمی کاتەوە. تیخەکەی سووڕاند، هەر ئەوەیکە

سەماسیەکە خلسکا و ڕزگار بوو، پیرەمێرد گوتی:" دەی گالانۆ، فەرسەخێک برۆ خوارتر برۆ بۆ لای هاوڕێکەت ڕەنگە دایکیشت."

پیرەمێرد تێخەی کاردەکەی خاوێن کردەوە و سەوڵەکەی خەواند. دواتر گرەی قەراغی چارۆگەکەی پەیدا کرد. چارۆگەکەی لە با دا و بەلەمەکەی خستە ڕێگای خۆیەوە.

بەرز گوتی:" یەک چوارمیان برد. باشترین گۆشتەکەی. بریا خەونم دیبا. بریا نەمگرتایە. بەداخەوە ماسی. کارەکەم تەواو خراپ بوو." ئیدی هیچی نەوت و نەیدەویست سەیری ماسییەکە بکات. ماسی کە خوێنەکەی ڕۆیشتبوو و لەشی شۆرابووە بە چەشنی جیوەی پشتەوەی ئاوێنە بوو جێی دەمارەکانی بەدیارەوە بوون.

گوتی:" ئەی ماسیی، من نەدبوو هێندە دوور بکەوتایەمەتەوە، نە بۆ من سوودێکی بوو نە بۆ تۆ ببوورە ماسی."

بەخۆی گوت، باشە سەیری گرێی چەقۆکە بکە نەپچڕابێت. دوایی بە دەستەکانت بگە چون زۆرت کار هەیە.

دوای ئەوەیکە گرێی چەقۆکەی لەسەر دەسکی سەوڵەکە بە تەواوەتی پشکنی. گوتی بریا لەتە بەردە هەسانێکم دەبوو چەقۆکەم تیژ دەکرد دەبوا بەردێکم لەگەڵ خۆم بێنابا. بە خۆی گوت دەبوا زۆر شتت لەگەڵ خۆت بهێنابایە، بەڵام نەتهێناوە. پیرەمێرد، ئێستا کاتی ئەوە نییە کە بزانی چیت نییە بزانە بەوەی هەتە دەتوانی چی بکەی.

بەرز گوتی:" قسەی باش باش دێتەوە مێشکم، ئیدی تاقەتم نییە."

سوکانەکەی لە بن باڵی نا و هەردوو دستی لە ئاوەکەدا شۆردەوە و بەلەمەکەشی بەرەو پێشێ دەخزا.

گوتی:" خودا دەزانێ ئەو ئاخرییە چەندەی برد بەڵام بەلەمەکە ئێستا زۆر سووکتر بووە." نەیدەویست سەبارەت بەو لاشە ڕیشۆڵ ڕیشۆڵ بوویەی ماسییەکە بیر کاتەوە. دەیزانی هەر جووڵەیەکی سەماسیەکە لەتە گوشت بوو کە لە ماسییەکە لێ کرابووە، ئێستا ماسییەکە ڕێ شوێنێکی بە پانیی شاڕێیەکی بۆ هەموو سەماسیەکان بەجێ دەهێشت."

بەخۆی گوت ئەم ماسییە نانی تەواوی زستانی منی دەدا، بیر لەمە مەکەوە تەنیا هێوەر بەوهەوڵ بدە کە دەستەکانت ئارام کەیتەوە و بێنەوە جێی خۆیان بۆ ئەوەی لەوەی وا ماوە بتوانی پارێزگاری بکەی. بەم هەموو بۆنە کە لە زەریادا ڕژاوە ئیدی بۆنی دەستەکانی من هیچ نییە دوای ئەمانەش ئیدی لە دەستەکانم خوێنی زۆر نایات. بڕینێکی ئەوتۆی نییە. خوێن ڕۆیین ئەگەری هەیە لە فەلەج بوونی دەستی چەپم ڕێگری بکات.

بە خۆی گوت ئێستا دەتوانم بیر لە چی بکەمەوە؟ هیچ شتێک. دەبێت بیر لە هیچ نەکەمەوە و چاوەڕێی سەماسیەکانی دیکە بم، بریا خەونم دیبا، بەڵام کێ چ دەزانێ؟ ڕەنگە باش بەڕێوە چوو.

سەماسیەکەی دیکە لمۆز پانێک بوو وەک بەرازێک کە هێرش بکاتە سەر خواردنەکەی هاتە پێش، گەر بەراز بتوانێ دەمی هێندە بکاتەوە کە سەری مرۆڤی تێدا جێ بێتەوە. پیرەمێرد ڕێگای دا کە سەماسیەکە خۆی لە ماسییەکە دا. چەقۆ بەستراو بە سەوڵەکەی

لە مێشکی ڕۆ کرد. سەماسیەکە گەڕاوەو تلی خوارد و چەقۆکەی شکا.

پیرەمێرد دانیشت و سوکانەکەی گرت. تەنانەت سەیری نەکرد کە سەماسی چۆن لە ئاوەکە چووە خوارەوە. سەرەتا بە ئاستێک سرووشتی بوو و دواتر چکۆلە بووە و دوای ئەوە چکۆلەوتر، بەڵام پیرەمێرد ئیدی هیچ  ئاوڕێکی لێ نەدایەوە.

گوتی:" ئێستا گۆچانەکەم هەیە بەڵام بێ سوودە، سەوڵەکان و سوکانەکەو و تێڵا کورتەکەش هەیە."

گوتی:" ئیدی بەزاندیانم، من بەم تەمەنەوە ناتوانم بە دارەوە دەرەقەتی سەماسیە بێم بەڵام تا کاتێک کە سەوڵەکان و تێڵا و سوکانەکەم هەیە شەڕ دەکەم."

دەستەکانی لە ئاوەکەدا وەردا و بڕێکی تەڕ کردن. کۆتاییەکانی نیوەڕۆ بوو و ئەو شتێک بێجگە لە زەریا و ئاسمان نەدەدی. با یەکی زۆرتر لە ئاسماندا گێژی دەخوارد و ئەو هیوادار بوو کە وشکی  بە زوویی دەرکەوێت.

گوتی:" پیرەمێرد تۆ هیلاکی، لە ناخەوە هیلاکی."

سەماسیەکان تا پێش خۆرنەشین هێرشیان نەکردە سەری.

پیرەمێرد باڵە قاوەیی ڕەنگەکانی بینی کە بە شوێنەوارێک وا ماسێ جێی هێشتبوو دەهاتن. تەنانەت بۆنی ماسییەکەیان لەم لاو لا نەدەدۆزییەوە . لە تەنیشتی یەک ڕاست بەرەو بەلەمەکە دەهاتن.

پیرەمێرد سوکانەکەی قیت جێگیر کرد. گرێی قەراغ چارۆگەکەێ بەست و دەستی برد و لە ژێر تەختەی پشتەوەی بەلەمەکە تێڵاکەی هڵ گرت. تێڵاکەی دەسکە سەوڵەیەکی شکاو بوو، بە درێژایی یەک متر دەبوو. تەنیا بە دەستێک دەکرا بە باشی بەکاری بێنی. چونکە تەنیا شوێن دەستێکی بوو. پیرەمێرد دەسکەکەی تووند بە دەستی ڕاستی گرت و جێگای دەستی خۆش کرد و سەرنجی هاتنی سەماسیەکانی دا هەردوو گالانۆ بوون.

لەگەڵ خۆی گوتی دەبێت ڕێگا بدەم هەوەڵ دانە بە باشی بە ماسییەکەوە بنووسێت، ئەوکات بەسەر قەپۆز یان تەپڵە سەری ڕاکێشم.

دوو سەماسیەکە بەیەکەوە پێش هاتن. پیرەمێرد هەر ئەوەی کە بینی ئەوەی کە نیزیکترە دەمی کردەوە و ددانەکانی لە پەراسووە زێوینەکەی ڕۆ کرد، گۆچانەکەی هەڵ گرت تووند هێنایە خوارەوەو بە تەپڵی سەری سەماسیەکەدا کێشای. هەستی بە سفتی و جیڕی لاستیکی سەری سەماسیەکە کرد هەروەها پتەوی ئێسکەکانی بە جوانی دەرکەوت و جارێکیش بە قەپۆزی سەماسیەکەدا کوتا و بینی کە ماسییەکەی بەجێ هێشت و چووە خوارەوە.

سەماسیەکەی دیکە دەهاتە پێشەوەو دەچووە دواوە و دواتر بە دەمی کراوەوە هات. سەماسی خۆی دا لە ماسییەکە و دەمی بەست و پیرەمێرد لەتە گۆشتی ماسییەکەی بینی کە سپی لە قەراغ دەمی سەماسیەکەوە هاتبوونە دەرێ. تێڵاکەی هێنا خوارەوەو تەنیا کێشای بەسەرسەماسیکەدا و سەماسی چاوێکی پێدا

گەڕاند و گۆشتی لە لەشی ماسییەکە کردەوە، پیرەمێرد دیسان تێڵاکەی هێنا خوارەوە بەڵام تەنیا بە جەستە پتەوەکەیدا ڕایدەکێشا.

پیرەمێرد گوتی:" وەرە گالانۆ وەرە پێش بزانم."

سەماسیەکە بە خێرایی هاتە پێشەوە و هەر ئەوەی دەمی وێکنا پیرەۆیاو پێدا کێشا، تێڵاکەی تا ئەو شوێنەی توانی بەرز کردەوە توونـد بە سەماسیەکەیدا کێشا. ئەمجار ئێسکی پشتە ملی سەماسیەکەی هەست کرد دیسان هەر بەو شوێنەیدا کێشا و سەماسیەکە لەگەڵ ئەوەی گۆشتەکەی هەڵدەدڕی و دەیدزی هێواش لە ماسییەکە بووەو خزاوە نێو ئاوەکەوە.

پیرەمێرد چاوەنواڕ بوو کە سەماسیەکە بگەڕێتەوە بەڵام هیچکامیان دیاریان نەکەوت. ئەوکات سەماسیەیەکی دیکەی بینی کە لەسەر ئاوەکە دەسووڕایەوە. باڵی ئەو سەماسیەی دیکەی نەبینی.

بەخۆی گوت کوشتنیان کاری من نەبوو. بەڵام کاتێک لاو بووم دەمتوانی. بەڵام هەردووکیانم لەکار خست. ئیدی هێندە توانا و گڕم تێدا نییە. گەر دەمتوانی تێڵاکە بە هەر دوو دەستم بگرم هەوەڵییەکەم حەتمی کوشتبوو. گوتی ئێستاش درەنگ نەبووە.

حەزی نەدەکرد سەیری ماسییەکە بکات. دەیزانی نیوەی لە ناو چووە. کاتێک کە خەریکی شەڕ بوو خۆر ئاوا ببوو.

گوتی:" ئێستا تاریک دەبێت ئەوکات ڕووناکی هاوانا بەدی دەکرێ. گەر زۆر بە لای ڕۆژهەڵات دا ڕۆیشتبێتم چراکانی یەکێک لە بەندرگە نوێکان دەبینم."

بە خۆی گوت ئێستا نابێت زۆر لە وشکی دوور بووبێتمەوە. هیوادارم کەس دڵ نیگەرانی من نەبووبێت. هەڵەبەت جگە لە کوڕەکە کەس نییە کە دڵ ئاڵۆزم بێت بەڵام بڕوام هەیە ئەو ئەرخەیانەو متمانەی هەیە. زۆری ماسیگرە پیرەکان دڵ ئاڵۆز دەبن. و زۆری دیکە. شاری ئێمە شارێکی میهرەبانە.

ئیدی نەیدەتوانی لەگەڵ ماسییەکە قسە بکات، چونکە ماسییەکە تەواو تێک شکابوو تفر و توونا ببوو ئەوکات کەوتە بیرێکەوە.

گوتی:" ئەو نیوە ماسی، هۆی ماسییە ساغەکەی کە بووی. ببوورە کە زۆر دوور کەوتمەوە. ژیانی هەردووکمان خراپ کرد بەڵام سەماسیەیەکی زۆرمان کوشت، من و تۆ، زۆریشمان شەل و پەل کرد ماسی تۆ چەن سەماسیەت کوشتووە؟ ئەو نێزەی قەپۆزت خۆ بێ هۆ نییە"

حەزی دەکرد کە ماسییەکە لای خۆی وێنا بکات و بیرکاتەوەکە گەر ئازادانە لە ئاودا مەلەی بکردایە چی بەسەر سەماسیەکاندا دەهێنا. بە خۆی گوت دەبوا نێزەی ماسییەکەم دەبڕییەوە و بەو لە سەماسیەکانم دەدا، بەڵام تەورم نەبوو. دوای ئەوەش چەقۆم نەبوو. بەڵام گەر بمبوایەو بەسەری سەوڵەکەوە بمبەستایەتەوە چ چەکێک دەبوو. ئەوکات بەیەکەوە سەماسیەکانمان لە ناو دەبرد. ئێستا گەر شەو گەڕانەوە چیت دەکەی؟ چی دەتوانی بکەی؟

گوتی:" شەڕ دەکەم. تا دەمەو مەرگ شەڕ دەکەم."

بەڵام ئێستا تاریک ببوو ئاسەوارێک لە ڕووناکی چراکان نەبوو و تەنیا بایەک دەهات و چارۆکەکان بەردەوام دەکێشران و ئەو بە

خۆی گوت کە ڕەنگە گیانی داوە. دەستەکانی لە سەر یەک داناو بەری دەستەکانی هەست کرد، نەمردبوو و هەر ئەوەندەی کە ئەو دەستەکانی دەکردەوە ئێشی ژیان تێیدا سەریان هەڵدەدا. پشتی بە تەختەی بەلەمەکەوە نابوو دەیزانی نەمردووە. شانەکانیشی هەر ئەوەیان پێ دەوت.

بە خۆی گوت چەندەم نزا و پاڕانەوەم هەیە. گوتم گەر ماسییەکە بگرم دەخوێنم بەڵام ئێستا هیلاکم، توانای نزا خوێندنم نییە. زۆر بەجێیە گەر تەلیسەکە هەڵگرم بەسەر شانەکانمدا بکێشم.

لەسەر تەختەکە ڕاکشا بوو و بەلەمەکەی لێدەخوڕی و سەرنجی ڕووناکییەکەی دەدا کە لە ئاسماندا دەرکەوت. بە خۆی گوت نیوەیم هەیە. ڕەنگە بەختم هەبوو نیوەی پێشووی ماسییەکەم بردەوە بۆ ماڵی. ڕەنگە وردە بەختێکم هەیە. نە تۆ بەختەکەت لە خۆت دوور کردۆتەوە چون زۆر دوور کەوتییەوە، لە ڕادەبەدەر.

بەرز گوتی:" هەڵیت و پڵیت مەڵێ، وریا بە بەخەبەربە، سۆکانەکە ڕاگرە، لە کوێ دەزانی بەختت هێستاش بەرز نەبێت؟"

گوتی:" گەر لە شوێنێک بیان فرۆشتایە، بڕێکم دەکڕی."

لە خۆی پرسی بە چی دەتکڕی؟ بەو نێزە لەدەس چووە و ئەو چەقۆ شکاوە ئەو دەستە زامدار و شەکەتانم؟

گوتی:" بەڵێ تۆ هەوڵی خۆت دا کە بیکڕی، بە هەشتاو چوار ڕۆژ کار لە زەریادا. پێتیان فرۆشتیش."

بە خۆی گوت خەیاڵە بێ ماناکە بنێ ئەو لاوە. بەخت شتێکە کە بە هەزار شێوە دەردێت کێیە کە بیناسێت؟ بەڵام بە هەر شێوەیەک بێت دەیکڕم، هەرچییان بهەوێت دەیدەم. گوتی بریا ڕووناکی چراکانم دەدی. زۆر شت هەیە کە دەیڵێم بریا، بریا. بەڵام ئەمە شتێکە کە ئێستا دەڵێم بریا دەمدی. هەوڵی دا ئاسوودەتر سۆکانەکە بگرێت و لە ئازاری لەشی زانی کە نەمردووە.

ڕەنگە کاتژمێر خۆی دابێت لە دە ی شەوە. کە تیشکدانەوەی ڕووناکی چراکانی شاری دی. هەوەڵ کز دەبینران. وەک ڕووناکی ئاسمان پێش لە دەرکەوتنی مانگ. پاشان ئەو پەڕی زەریا ڕووناک بوو. ئێستا با هەڵی کردبوو و زەریا ئاڵۆز ببوو. پیرەمێرد بەرەو ڕووناکی دەڕۆیشت، و بیر دەهاتە مێشکییەوە کە هێندەی نەماوە بە پەراوێزی تەوژمی ئۆقیانووسەکە بگات.

بە خۆی گوت ئیدی تەواو بوو. ڕەنگە دیسان هێرش کەنەوە. بەڵام مرۆڤ بێ چەک لە نێو تاریکی چی لەدەس دێت؟

ئێستا لەشی وشک پڕ زام و ئازار بوو. برینەکانی و شوێنە کوتراوەکانی لەشی سەرمای شەودا دەکولاوە. بە خۆی گوت هیوادارم دیسان تووشی شەڕ نەبمەوە. بەڕاستی هیوادارم دیسان ناچار نەبم.

بەڵام نیوە شەو دیسان شەڕی کرد، ئەم جار زانی بێسوود شەڕ دەکات. پۆلێک سەماسی هاتبوون و پیرەمێرد تەنیا هێڵ گەلێکی دەدی کە باڵەکانیان لە نێو ئاوەکە دەیکێشا و ڕووناکی درەوشانەوەی فۆسفۆڕی لەشیان کە هێرشیان کردە سەر ماسییەکە . پیرەمێرد دەیکێشا بە کەلەی سەریان و دەنگی لێک

درانی ددانەکانی دەبیست و هەستی بە جووڵانەوەی بەلەمەکە دەکرد و دەیزانی کە لە ژێرەوە ماسییەکە هەڵدەدڕن. بێهیوایانە بەوەی وا هەستی دەکرد و دەیبیست دەکووتا و هەستی کرد کە شتێک دارەکەی گرت و بردی.

دەسکی سۆکانەکەی بە هەر دوو دەستی گرت و لێیدا و کێشای و چەن‌جار چووە سەرەوە هاتە خوارەوە. بەڵام ئێستا سەماسیەکان گەیشتبوونە پێشەوەی بەلەمەکە، بەیەکەوە هێرش دەکەن و لەتە گۆشتی ماسییەکە کە لە ژێر ئاوەکە دەدرەوشایەوە، هەڵدەدڕی و دەیانبڕی و دیسان دەگەڕانەوە .

دەرئەنجام سەماسیەیەک هێرشی کردە سەر کەلەی ماسییەکە و پیرەمێرد زانی کە کار تەواوە. ددانەکانی سەماسی بە سەرە قورسەکەی ماسییەکە نیشتەوە و گیری کردبوو و پیرەمێرد دەسکی سۆکانەکەی بەسەری سەماسیەکە هێنا خوارەوە. بەڕدەوام بەدوای یەکدا دەی‌هێنایە خوارەوە. دەنگی شکانی دەسکی سۆکانەکەی بیست و سەرە شکاوەکەی لە جەستەی کووسەکە ڕۆ کرد. ڕۆ چوونی دارەکەی  هەست پێ کرد و زانی کە تیژە و دیسان ڕۆی کرد سەماسی ماسییەکەی بەجێ هێشت و لە ئاوەکە تلایەوە، ئەمە دواهەمین سەماسیی ئەم پۆلە بوو. ئیدی هیچ نەبوون کە بیخۆن.

پیرەمێرد بە دژواری هەناسەی دەکێشا و تامێکی نامۆی لە دەمیدا هەست پێ کرد. تامێک وەک مسین و شیرنجق بوو، پیرەمێرد ساتێک ترسا بەڵام زۆر نەبوو.

تفی کردە نێو ئاوەکەو گوتی:" بخۆن گالانۆکان. دواییش خەو ببینن کە مرۆڤتان ڕاو کردووە."

دەیزانی کە دەرئەنجام دۆڕابوو و هیچ چارەسەرێکی نییە. بە دواوەی بەلەمەکە گەڕاوە و بینی کە بنە شکاوەکەی دەسکی سۆکانەکە لە نێو قەڵەشەکەیەوە دەچێت بۆ ئەوەی هەر ئەوەندەی کە بتوانێ بەلەمەکە لێخوڕێت. تەلیسەکەی بەسەر شانەکانیا کێشا و بەلەمەکەی خستە ڕێگای خۆیەوە. ئێستا سووک دەچووە پێشەوە و هیچ بیر و هەستێکی نەبوو. ئێستا لە هەموو شتێک تێپەڕابوو و بەلەمەکەی لێ دەخوڕی بۆ ئەوەی زیرەکانەو بە باشی خۆی بە بەندەر بگەیەنێت. شەو سەماسییەکان هێرشیان کردە سەر ماسییەکە وەک کەسێک وردەکانی ناو سفرەیەک هەڵ گرێتەوە. پیرەمێرد گرینگی پێ نەدەدان. گرینگی بە هیچ شتێک نەدەدا جگە لە لێ خوڕینی بەلەمەکە. تەنیا ئاگادار بوو کە ئێستا بەلەمەکە بارێکی قورسی پێوە نییە و زۆر سووک و باش بەرەو پێش دەچێت.

بە خۆی گوت کە بەلەمەکە ساغە جگە لە دەسکی سۆکانەکە، هیچ کوێی نوقسانی نییە ئەویش کێشەیەک نییە.

هەستی دەکرد ئێستا لە تەوژمی کەنداوەکەدایە وچراکانی شارە کەنارییەکان کە بە درێژایی وشکی کێشراوە دەبینرا. ئێستا دەیزانی لە کوێیە و گەیشتن بە بەندەر کارێکی ئاسانە.

بە خۆی گوت هەرچۆنێک بێت با لەگەڵمان هاوڕێیە. دواتر درێژەی دا کە ئەم زەریا گەورەیە پڕە لە دۆست و دوژمن. و گوتی پێخەف. پێخەف هاوڕێی منە. تەنیا پێخەف. چ شتێکی چاکە

پێخەف. گوتی کە دۆڕاندت کار ئاسان دەبێتەوە. نەمدەزانی بەم ئاسانییەیە. و پرسی چ شتێک بووە هۆی دۆڕانت؟

بەرز گوتی:" هیچ، زۆر دوور کەوتمەوە."

کاتێک چووە بەندرگە چکۆلەکە چراکانی کافە تراس کووژابوونەوە و پیرەمێرد دەیزانی کە ئێستا هەموو لە خەودان. با وردە وردە توونتر بوو بەرەو گێژێکی گەورە دەچوو. بەڵام بەندرگە ئارام بوو. پیرەمێرد بەلەمەکەی بەرەو پەڵە زەوی زیخڕێژی ژێر کەڵەکە بەردەکان ڕاکێشا. کەسی لێ نەبوو هاوکاری بکات. خۆی تا ئەو شوێنەی توانی بەلەمەکەی ڕاکێشا. دوایی هاتە دەرێ و بەلەمەکەی بە بەردەکان بەستەوە.

کۆڵەکەکەی خەواند و چارۆکەکەی هەڵپێچاو و گرێی دا.  دوایی کۆڵەکەکەی لە کۆڵ نا و بەرزاییەکەی گرتە بەر. ئەوکات بە باشی لە قووڵایی هیلاکییەکەی خۆی گەیشت. ساتێک ڕاوەستاو سەیری دواوەی کرد و لە تیشکی چراکانی شەقام کلکە گەورەکەی ماسییەکەی بینی کە لە دواوەی بەلەمەکە بەرزەوە ببوو. هێڵی سپی و ڕووتی بڕبڕە پشتی ماسییەکەی بینی وکەلەسەری ڕەش و بە نێزە درێژەکەیەوە و هەموو چۆڵی نێوان سەر و کلکی.

دیسان وەڕێ کەوت و لە کۆتایی هەورازەکە کەوتە زەوی و بە کۆڵەکەکەی سەشانی ماوەیەک بەسەر زەویەوە بوو. هەوڵی دا هەستێت بەڵام نەیتوانی و هەر لەوێ بە کۆڵەکەکەی کۆڵیەوە دانیشت و سەیری کۆڵانەکەی کرد، ئەو پەڕی کۆڵان پشیلەیەک ڕۆیشت بە لای کاری خۆیەوەو پیرەمێرد سەیری کرد. دواتر نیگای بە کۆڵانە چۆڵەکەدا گێڕا.

دەرئەنجام کۆڵەکەکەی لەسەر زەوی دانا و ڕاوەستا. کۆڵەکەکەی هەڵگرت و لەسەر کۆڵی دانا و بەرەو سەرەوەی کۆڵانەکە ڕێکەوت. بۆ ئەوەی بە ماڵەکە بگات پێنج کەڕەت ناچار بوو دانیشێت.

لە نێو ماڵەکە کۆڵەکەکەی بە دیوارەکەوە هەڵپەسارد. لە تاریکیدا گۆزەڵەکەی دۆزییەوەو قومێ ئاوی خواردەوە. دواتر لەسەر پێخەفەکەی ڕاکشا و پەتووەکەی بەسەر شانەکانی کێشا. دواتر بەسەر پشت و لاقەکانی و دەمەو ڕوو لەسەر ڕۆژنامەکان خەوت و دەستەکانی بەلای خۆی دا درێژ کردەوە. بەری دەستەکانی بەرەو سەرەوە بوو.

سبەینێ کە کوڕەکە لە بڕگەی دەرگاکەوە سەری کێشا پیرەمێرد خەوتبوو. با هێندە بە توندی هەڵی کردبوو کە بەلەمەکان ئەمڕۆ نەدەڕۆیشتنە دەرەوە و کوڕەکە تا درەنگانێ خەوتبوو و دوایی هاتبوو بۆ کۆختی پیرەمێرد بەو شێوەی کە هەموو ڕۆژێک دەهات. کوڕەکە دی کە پیرەمێرد خەریکە هەناسە دەکێشێت و ئەوکات دەستەکانی پیرەمێردی دی و دایە پرمەی گریان. زۆر هێواش چووە دەرەوە بۆ ئەوەی بڕێک قاوە بێنێت ، لە تەواوی ڕێگاکەدا لە کوڵی گریان نەدەبووە.

چەن ماسیگرێک بەدەور بەلەمەکەوە کۆ ببوونەوە سەیری ئەوەیان دەکرد کە بە تەنیشتی بەلەمەکەوە بەسترابووە، یەکیان لە نێو ئاوەکە بوو دەلینگی پانتۆڵەکەی دابووە سەرەوە و بە گوریس کەلاکی ماسییەکەی دەپێوی.

کوڕەکە نەچووە خوارەوە . بەرلەمە ڕۆیشتبوو یەکێک لە ماسی گرەکان لە لای ئەوە دەچووە لای بەلەمەکە و ڕاسپاردەی ئەو بوو.

یەکێک لە ماسی گرەکان دەنگی هەڵ هێنا، "چۆنە؟"

کوڕەکە گوتی:" خەوتووە". حەزی نەدەکرد گریانەکەی ببینن." لێی گەڕێن بخەوێت."

ماسیگرێک کە ماسییەکەی دەپێوا گوتی لە نێزەی قەپۆزییەوە تا کلکی هەژدا پا دەبێت.

کوڕ گوتی:" بڕوا دەکەم."

چووە کافە تڕاسەوە داوای جێیەک قاوەی کرد. " داخ بێت شیر و شەکری زۆر بێت."

" شتی دیکەت ناوێ؟"

" نا داواتر بزانم چی دەتوانێ بخوات."

خاوەن کافەکە گوتی" چ ماسییەک بووە، تا بە ئێستا چۆن ماسییەکیان ڕاو نەکردبوو. ئەو دوو ماسییەی کە ئێوەش دوێنێ گرتتان زۆر باش بوو."

کوڕ گوتی:" قوڕ بەسەر ماسی من." دیسان دایە پرمەی گریان.

خاوەن کافەکە پرسی:" خواردنەوەت ناوێ؟"

کوڕ گوتی:" نە پێیان بڵێ با سانتیاگۆ بێزار نەبێت، من هەر ئێستا دەگەڕێمەوە."

" پێی بڵێ زۆر بەداخەوەم."

کوڕ گوتی:" سپاس."

کوڕەکە جێ قاوەکەی بۆ کوختەی پیرەمێرد برد و دانیشت تا وەخەبەر هاتەوە، جارێک وا بۆی چوو کە خەریکە هەڵدەستێ، بەڵام دیسان چووە خەوێکی قورسەوە و کوڕ چووە ئەو پەڕی کۆڵانەوە بڕێک داری قەرز گرت کە قاوەکە گەرم کاتەوە.

دەرئەنجام پیرەمێرد وەخەبەر هاتەوە.

کوڕەکە گوتی: "هەڵمەستە ئەمە بخۆوە، بڕیک قاوەی لە پەرداخەکەی کرد."

پیرەمێرد قاوەکەی لە دەستی وەرگرت و خواردییەوە.

گوتی:" مانۆلین، بەزاندیانم، بەڕاستی بەزاندیانم."

" ئەو کە نەیبەزاندی، خودی ماسییەکە خۆ نەیبەزاندی."

" نا. درووستە. دوایی بەزام."

" پێدریکۆ ئاگاداری بەلەم و کەرەسەکانتە، سەری ماسییەکە چی لێ دەکەی؟"

" بڵێی پێدریکۆ لەت و کوتی کات بۆ چێشتەی نێو داوی ماسی."

" نێزەکەی چی؟"

" گەر دەتهەوێ بۆ تۆ."

کوڕەکە گوتی:" دەمهەوێ، ئێستا دەبێ پلانی کارەماوەکانمان بکێشین."

" بەدوای مندا دەگەڕان؟"

" بێ گومان، بە پۆلیسی زەریا، بە فڕۆکە."

پیرەمێرد گوتی:" زەریا زۆر پان و بەرینە بەلەمی منیش چکۆلەیە باش نابینرێ." تێگەیشت کە چ باشە کەسێک بێت کە لەگەڵی قسە بکەی بە جێی ئەوەی تەنیا لەگەڵ خۆی و و زەریا قسە کەی. گوتی:" جێت خاڵی بوو ئێوە چیتان گرت؟"

" ڕۆژی هەوەڵ یەکدانە، ڕۆژی دووەم یەکدانە، دوو دانەش لە ڕۆژی سێهەم."

" زۆر باشە"

" لەمە بەدوا بەیەکەوە دەڕۆین."

" نا من بەختم باش نییە، من بەختم داویەتە دواوە."

کوڕ گوتی:" بەخت چییە؟ من بەخت لەگەڵ خۆم دێنم."

" بنەماڵەت چی دەڵێن؟"

" هەرچییان پێخۆشە با بڵێن. من دوێنێ دوو دانەم گرت، دەبێ بەیەکەوە بڕۆین. ئێستاش زۆر شت ماوە کە دەبێ فێر بین."

" دەبێ نێزەیەک بۆ لێدانی ئاخر بە باشی درووست کەین و هەمووکات لە بەلەمەکەدا بێت. سەرەکەی دەتوانین لە ئیسپرینگی ماشینێکی فۆڕدی کۆنە درووست کەین. دەڕۆین گرِاناباکۆئا دەیدەین بۆمان تیژ کەن. دەبێ تیژ بێت. کول بێت دەشکێ، چەقۆکەم شکا."

چەقۆیەکی دیکە دەکرِم ئیسپرینگی ماشێنێک تیژ دەکەم. چەن ڕۆژی دیکەم ئەم ڕەشە بایەمان لەگەڵ دەبێت؟

" ڕەنگە سێ ڕۆژ ڕەنگە زۆرتر."

کوڕەکە گوتی:" من هەموو شتێک ڕێک و پێک دەکەم، تۆ دەستەکانت چاکەوە باوکە."

" دەزانم چییان لێ کەم. شەو شتێکی سەیر و نامۆم لە نێو دەمم هەست کرد، دەڵێی شتێک لە سنگما شکا."

کوڕ گوتی:" ئەویش باشکە، ڕاکشێ باوکە، دەڕۆم کراسێکی خاوێنت بۆ دێنم شتێکیش دێنم بیخۆی."

پیرەمێرد گوتی:" لە ڕۆژنامەی ئەو ڕۆژانەی وا نەبووم هەرچی دەتوانی کۆکەوەو بیهێنە."

" دەبێ زوو چاک بیتەوە بۆ ئەوەی زۆر شت هەیە کە من دەبێ فێر بم، تۆش دەتوانی فێرم کەی. زۆرت ئازار بینی؟"

پیرەمێرد گوتی:" زۆر."

کوڕەکە گوتی:" من ڕۆیشتم خواردن و ڕۆژنامە بێنم، پشوو بدە باوکە، لە دەرمانخانە بۆ دەستەکانت دەرمان دێنم."

" لە بیرت نەچێت بە پێدریکۆ بڵێ سەرەکەی بۆ تۆ."

" نا لە بیرمە."

کاتێک کوڕەکە لە درگاکە چووە دەرەوە و لە کۆڵانی بەردڕێژە مەرجانییە کۆنەکە چووە خوارەوە دیسان دەستی کرد بە گریان.

ئەو دوانیوەڕۆیە تاقمێک توووریست هاتبوونە کافە " تراس" و ژنێک کە جێگا بەتاڵەکانی ئاوجۆ و لاشەی ژار ماسیەکانی لە زەریا چاو لێ دەکرد، چاوی بە بڕبڕیەکی پشتی گەورەی سپی کەوت کە کلکێکی گەورەی پێوەبوو. زریان شەپۆل گەلی قورسی بە دوای یەکدا تا بەندرگەکە دەهێنا و کلکی ماسی بە ئاوەکە بەرز دەبووە لەنگەر دەکەوت.

ژن لە یەکێک لە گارسۆنەکانی پرسی:" ئەمە چییە؟ " بە تیری درێژی ماسی گەورەکە ئاماژەی کرد کە ئێستا تەنیا زبڵێک بوو کە لەگەڵ چوونە خوارەوەی ئاوەکە لە کەنارەکە دوور کەوێتەوە.

گارسۆن گوتی:" کووسە کووسە." مەبەستی ئەوە بوو سەماسی وای کردووە.

" نەمدەزانی سەماسی کلکێ بەم جوانییەو ڕێک و پێکییەی هەیە."

ئەو پیاوەی کە لەگەڵی بوو گوتی:" منیش نەمدەزانی."

ئەوسەری کۆڵان، پیرەمێرد لە کوختەکەیدا چبووە خەو، دەمەو ڕوو خەوتبوو و کوڕەکە لەلایەوە دانیشتبوو لێی دەڕوانی. پیرەمێرد خەونی شێرەکانی دەبینی.

فەرهەنگۆک:

١. چارۆگە : بادبان

٢. سەوڵ : پارو

٣. سەماسی : کوسە